حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عیراق

وەزارەتا پەروەردێ

ڕێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# پەروەردەیا ئیسلامی

## بۆ پۆلا هەشتێ بنەڕەت

**بەرهەڤکرن**

| عبدالله عبدالرحمن | فاروق محمد علی عباس | واحد حمه صالح |
| --- | --- | --- |
| خواجه طه شاهین | آزاد عمر سید أحمد | عبدالجبار محمد شریف |

**وەرگێڕان بۆ کرمانجیێ**

ئیسماعیل طه شاهین        تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

**چاپا دووێ** | **٢٧١٦ کوردی** | **٢٠١٦ زایینی** | **١٤٣٧ مشەختی**

## ب ناڤێ خودێ مەزن و دلوڤان

# پێشگۆتن

ئەڤ کتێبە – پەروەردەیا ئیسلامی بۆ ڕێزا هەشتێ یا بنەڕەت– پێگاڤەکا دییە ژ نەخشەیێ گوهۆڕین و پێشئێخستنا پرۆگرامێ بابەتێ پەروەردەیا ئیسلامی، ئەوێ وەزارەتا پەروەردەیێ بڕیار پێ دایی، و بۆ ب سەرێکڤەئینانا ڤی کاری و هنگاڤتنا ڤێ ئارمانجێ ئەم وەک لژنە هلبژارتین.

د بەرهەڤکرنا ڤێ کتێبێدا تشتێ گرنگێ ب خەم هاتییە وەرگرتن، گوهۆڕینا ئاوایێ (شێوازێ) بەرچاڤکرنا وانەیانە، سەربارى بابەتێن وانەیان ب خوە ژى، کو جودانە ژ یێن پرۆگرامێ پێشتر، و تەمامکەرن بۆ پرۆگرامێ ڕێزا حەفتێ، مە بزاڤ کرییە د ڤێ کتێبێدا، زێدەى کارێن ب پەرستنێڤە گرێدایی، ئەم پیتەیەکێ ڕژد بدەینە هندەک ئالیێن دى یێن گرنگ ژى، وەکى هندەک چام و عیبرەتان ژ چیرۆکێن قورئانێ و ژینەنیگارا پێغەمبەران و دانەناسینا ژین و ژیارا هندەک هەڤال و هۆگرێن پێغەمبەرى و چەند کەسەکێن پشتى وان هاتین، د گەل دانەناسینا هندەک ژ وان زانایان، ئەوێن خزمەتا ڕێبازا گازییا ئیسلامى کرین. ئارمانجا مە ژ ڤێ هەمییێ ئەوە، ئەم کوڕێن خوە یێن قوتابى، د دینیدا شارەزا بکەین، و وان ل دووڤ پەروەردەیەکا ڕاست و دورست پەروەردە بکەین، دا بشێن ڕۆلێ خوە ب دورستى د ئاڤاکرنا پاشەڕۆژا وەلاتێ خوەدا ببینن.

هەر وەکى مە د پێشگۆتنا کتێبێن قۆناخێن پێشتردا ژ ڤی پرۆگرامی گۆتی، جارەکا دى و دوبارە ئەم دێ بێژین، کارێ لژنەیا مە ل ئێرە ب دووماهى دئێت، و ب هندێ کارێ هەڤکارێن مە، مامۆستایێن پەروەردەکەر دەست پێ دکەت. ئەرکێ وان ژى بێ گۆمان ئەوە، ڤێ نامەیێ ئێکسەر و ڕوو ب ڕوو بگەهیننە کوڕێن مەیێن قوتابى. دوور نائێتە دیتن، د بەر کارێ خوەڕا، ب سەر هندەک کێماسییان ژى هلببن، مە پێ خوەشە، مە ژێ ب ئاگەهـ بێخن، دا ئەم بشێین، د چاپێن پاشتردا، ڕێکا خوە ل سەر بگوهێزین و خوە ژێ بدەینە پاش.

ل دووماهییێ ژى، داخوازا مە ئەوە، خودایێ مەزن ڕێکا سەرکەڤتنا ڕێبازا پەروەردەیى د کوردستانێدا، ل بەر مە سانەهى و خوەش بکەت، و مە هەمییان تێدا بکەتە دەستێن ب سەرئێخستن و ئاڤاکرنێ.

**لژنەیا بەرهەڤکرنێ**

### وانەیا ئێکێ

## باوەری ب کتێبێن ئەسمانی

**ئازادی** داخواز ژ باپیرێ خوە کر، کو بۆ هندەک شیرەت و پەندان ژ کتێبێن ئەسمانی، ئەوێن خودێ بۆ پێغەمبەران هنارتین کورت بکەت.

**باپیرێ** وی گۆت: بەلێ کورێ من، خودایێ مەزن پشتەڤانی و هاریکارییا پێغەمبەرێن خوە دکر، ب رێکا هنارتنا نامە و پەیامێن خوە، و تێدا دوژمنێن وان شەرمزار و رسوا دکرن و هەمی بزاڤ و کریارێن وان پووچ و بەتال دکرن و دشکاندن، چونکی نەهەقی چەند بلند ببت و پشتەڤان و هاریکار بۆ چێ ببن، چو پێ نەڤێت، بەرانبەری هەقییێ دێ هەر شکێت و خوە ناگرت.. خودایێ مەزن د چیرۆکا مووسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) و فیرعەونیدا دبێژت: ﴿وَاسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ.. ﴾ (القصص:٣٩). دەروونێ مرۆڤی ژ هەر تشتەکی پتر، ب نەخوەشی و کارەساتان دئێتە جەرباندن، و سەرکەڤتنا پێغەمبەران (سلاڤێن خودێ ل هەمییان بن) ل سەر گاوری و شرکێ، نموونەیەکی ئاشکەرایە بۆ نەهێلان و هەرافتنا ستەمکارییێ و ب هێزترین رێخوەشکەرە بۆ موکومکرنا ڤیانا وان و رژدییا وان ل سەر گەهشتنا ئارمانجێ د روویێ هەمی ئاستەنگاندا، و ئەڤ شیرەت و پەندە ژێ دوباری بۆ ستەمکار و زۆردارانە، و دەرس و وانەنە بۆ مللەتێن ستەملێکری، دا خوە راگرن و سنگێ ستەمکارییێ بگرن، چونکی دووماهییێ هەر دێ سەرکەڤتنێ ب دەست خوەڤە ئینن.



**ئازاد:** باپیر تو چ ژ کتێبێن ئەسمانی دزانی؟

**باپیر:** کورێ من، کتێبێن ئەسمانی ئەوێن د قورئانا پیرۆزدا بەحس ژێ هاتییەکرن ئەڤەنە: بەرپەڕێن ئیبراهیم و مووسا پێغەمبەری(سلاڤ لێ بن)، ئەوێن خودێ بۆ وان هنارتین، هەر وەکی د قورئانێدا هاتی: ﴿إِنَّ هَذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَى ۝١٨ صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى ۝١٩﴾ (الأعلى: ١٨، ١٩).

**تەورات:** ئەو کتێبە یا خودێ بۆ مووسا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) هنارتی، و داخواز ژ پێغەمبەرێن پشتی وی هاتین کرییە کو فەرمانێن وێ بجهـ بینن.

**زەبوور:** ئەو کتێبە ئەوا خودێ بۆ داود پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) هنارتی، هەر وەکی خودایێ مەزن ب خوە د قورئانێدا دبێژت: ﴿... وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾ (الإسراء: ٥٥).

**ئنجیل:** خودایێ مەزن ئەڤ کتێبە بۆ عیسا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) هنارتییە، هەر وەکی ئەو ب خوە د قورئانێدا دبێژت: ﴿ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ...﴾ (الحديد : ٢٧).

**قورئانا پیرۆز:** ئەو کتێبە یا خودێ بۆ دووماهی پێغەمبەرێ خوە (سلاڤ لێ بن) کرییە موعجیزە، و بۆ هەمی جیهانێ و هەمی خەلکی هنارتی، و وەکی کتێبێن بەری خوە، ئەو نە یا تایبەتە ب ملەتەکی دەستنیشانکریڤە، و خودایێ مەزن د قورئانێدا دبێژت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ (سبأ ٢٨).

مرۆڤێ موسلمان باوەرییێ ب هەر تشتەکی دئینت کو د ڤان کتێباندا هاتبت، ب مەرجەکێ دژی قورئانێ نەبت، چونکی ئارمانج ژ هنارتنا وان ڕاستەڕێکرنا مرۆڤییە بۆ ڕێکا ڕاست و دورست.

**ئازاد:** سوپاس باپیر بۆ ڤان پێزانینێن گرنگ.

## دان و ستاندن:

١-باوەرییێ پێناسە بکە.

٢- ئارمانج ژ هنارتنا کتێبێن ئەسمانی چیە؟

٣- ئیعجازا قورئانا پیرۆز د چ دایە؟

٤- خودایێ مەزن ب چ بەنییێن خوە دجەربینت؟

## بزاڤ و چالاکی:

ڤێ ئایەتا پیرۆز ژ بەر بکە:

﴿ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ المَصِيرُ ﴾ (البقرة: ٢٨٥).



## وانەیا دویێ

# باشیکرن د دینی و پەرستنێدا

خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لله وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ (البقرة: ١١٢)، هەر وەسا دبێژت: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لله وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا﴾ (النساء: ١٢٥)، خودایێ مەزن ل سەری بەحسێ باشیکرنێ د دینیدا کر، پاشێ بەحسێ باشیکرنێ ب گشتی کر.

باشیکرن د دینیدا، ئەوە – و خودێ پێ ئاگەهە– ئەوا جبریلی د فەرمۆدەیەکێدا پسیارا وێ کری کانێ ئەو چیە؟ پشتی پسیارا ئیسلام و باوەرێ ژ پێغەمبەری کری. ملیاکەتێ پیرۆز جبریل (سلاڤ لێ بن) ل سەر وێنەیێ زەلامەکێ جلک سپی و مووڕەش و وەک ڕێڤنگەکێ چو نیشانێن وەستیان و وەغەرێ لێ دیار نە، هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) و هەڤال و هۆگرێن پێغەمبەری ل دۆرا وان بوون، ئێکێ ب تنێ ژێ جبریل (سلاڤ لێ بن) ناس نەکر. جبریلی هند خوە نێزیکی پێغەمبەری کر، هەتا چۆکێن خوە گەهاندینە یێن وی و دەستێن خوە داناینە سەر ڕانێن وی. هندەک پسیارێن مەزن ژ پێغەمبەری کرن و پێغەمبەری ژی (سلاڤ لێ بن)، بێ ڤەمان و ڕاوەستان، بەرسڤا وی ددا.

پسیارا ئیسلامێ و باوەرێ ژێ کر، و پاشێ پسیارا باشیکرنێ ژێ کر، ئینا پێغەمبەری د بەرسڤا باشیکرنێدا گۆت: ((باشیکرن، ئەوە تو خودێ وەسا بپەرێسی، هەچکو ئەو ل بەر چاڤێن تە، ژ بەر کو ئەگەر تو وی نەبینی، ئەو تە دبینت)). ئەڤ گۆتنا پێغەمبەری، ڕامانەکا گەلەک مەزن ددەت. باشیکرن دو ڕەوشتان ب خوەڤە دگرت، و یا ژ هەردویان بلندتر، ئەوە مرۆڤ دیتنا خودایێ مەزن ب دلی بینتە بەر چاڤێن خوە، ئەڤە ڕامانا ((هەچکو ئەو ل بەر چاڤێن تە)) ددەت، و یا دویێ بینتە بەر چاڤێن خوە، کو خودێ ژێ ب ئاگەهە، و هەر کریارەکا ئەو دکەت خودێ دبینت، ئەڤەیە ڕامانا ((ئەو تە دبینت)). ئەڤ هەردو ڕەوشتە ژ ناسین و ترسا خودێ دەردکەڤن، و ئەڤ ڕامانە د قورئانا پیرۆزدا، د گەلەک جهاندا هاتییە. خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ أَلَا إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا مِنْهُ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾ (هود : ٥). خودایێ مەزن د ڤێ ئایەتا پیرۆزدا، دیار دکەت، کو چو تشت، ل بەر وی بەرزە و وندا نینن، و نەپەنی و ئاشکەرا ل دەڤ وی ئێکن، ئەو دزانت کا چ د دلاندایە، و کا دل چ دیار دکەن و چ ڤەدشێرن. ئەگەر مرۆڤێ بێ هێز و بێ دەستهلات زانی خودایێ وی ژێ ب ئاگەهە و های ژ هەر تشتەکێ هەیە کو ئەو بێژت یان بکەت یان بکەتە دلێ خوە، دلێ وی دێ نەرم و تژی باوەری بت و دێ ژ خودێ ترست و دێ ژ بۆ کنارێ خودێ کار و کریارێن باش کەت.

باشیکرن: ئەوە تو وەسا خودێ بپەرێسی، هەچکو تو وی دبینی، ئەگەر تو وی نەبینی ژی، ئەو هەر تە دبینت. بەلێ ئەگەر تو وی نەبینی، بەردەوام ببە ل سەر باشیکرنا پەرستنێ، چونکی خودێ تە دبینت و وی ئاگەهـ ژ تە هەیە.. ئەڤە بنەمایەکێ مەزنە ژ بنەمایێن دینی و یاسایەکا گرنگە ژ یاسایێن موسلمانێن باش و کێرهاتی، گۆتنا پێغەمبەری: ((باشیکرن، ئەوە تو خودێ وەسا بپەرێسی، هەچکو ئەو ل بەر چاڤێن تە، ژ بەر کو ئەگەر تو وی نەبینی، ئەو تە دبینت)) نیشا مە ددەت. زانا بۆ رامانا ((هەچکو تو وی دبینی)) دبێژن: ((تو د پەرستنا خودێدا، وەسا خوە ب تۆرە و ئەدەب بێخی، هەچکو ئەو پێشبەری تە و تو وی ب چاڤ دبینی)). ب راستی ئەگەر ئەم ڤێ رامانێ د هەمی سنج و رەوشتێن خوەدا، د هەمی رابوون و روونشتنێن خوەدا، د هەمی بازارێن خوەدا.. د هەمی پەرستنێن خوەدا.. د هەمی پەیوەندی و ئاخڤتن و گۆتن و کریارێن خوەدا، بینینە بەر چاڤێن خوە، ئەها هنگی ئەم دێ رازیبوون و لێبۆرینا خودایێ مەزن، ب دەست خوەڤە ئینین.

## پسیار:

١- کی هاتە جڤاتا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) دا پسیارا کاروبارێن دینی ژێ بکەت؟ ئێک ژ وان پسیارێن ژێ هاتینەکرن، ل سەر باشیکرنێ بوو، ئەرێ مەرەم و مەخسەد ژێ چیە؟

٢- خودایێ مەزن ئیشارەتێ ددەتە کێ، دەمێ دبێژت: ﴿بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾؟

## بزاڤ و چالاکی:

ژ وێ یا تە پێشتر خواندی، بابەتەکی ل سەر باشیکرنێ بنڤیسە، کو هەمی رەخ و روویان بگرت.

## وانەیا سێیێ

# تشتێ پشتی مرنێ مفایی دگەهینتە مرۆڤی

پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ)).

ئانکو: ئەگەر مرۆڤ مر، کارێ وی ب دووماهی دئێت، ژ بلی سێ تشتان: خێرەکا بەردەوام کو مرۆڤ ل پشت خوە دهێلت، یان زانینەکا مفا ژێ بێتە وەرگرتن، یان دووندەهەکا باش بەردەوام دوعایان بۆ بکەت.

دیارە، دەمێ مرۆڤ دمرت، ب ئەگەرێ مرنێ کار و کریار بنبڕ دبن، چونکی کار و کریار د دنیایێدا دئێنەکرن، و ژ سێ تشتان پێڤەتر – ل دووڤ فەرمۆدەیا بۆری- کارەک ل دوو مرۆڤی نامینت، مفایی بگەهیننە مرۆڤی، چونکی مرۆڤ ئەگەرێ وان هەر سێ تشتانە.

تشتێ ئێکێ خێرا بەردەوامە (صدقة جارية) : کو مرۆڤ بیستانێ خوە یان زەڤییا خوە بۆ ژار و دەستتەنگان بکەتە وەقف. هندی ئەو کەسێن ژار و دەستتەنگ مفایی ژێ ببینن و ژ بەر و بەرهەمێ بیستانی یان زەڤییێ بخون، دێ هەر خێرا خودانی ئێتە نڤیسین، ڕاستە خێر پشتی مرنا خودانی پەیدا دبت، بەلێ هەر مری، ئەگەرێ پەیداکرنا وێیە.

تشتێ دویێ، ئەو زانینە یا مفا ژێ دئێتە وەرگرتن. بۆ نموونە ئێک ب ساخییا خوە، خەلکەکی فێری زانینەکێ بکەت و بەرێ وان بدەتە خێرێ و کار و کریارا باش، گاڤا خەلک فێربوو و پشتی مرنا وی مفا ژ فێربوون و نیشادانا وی وەرگرتن، خێرا مری ژێ تێ دکەڤت، بێ کو تشتەک ژ خێرا کەسێن پشتی وی کێم ببت، چونکی کەسێ بەرێ مرۆڤی بدەتە خێرێ، وەکی خێرکەری ب خوەیە و ئەڤە بەلگە و نیشانە ل سەر بەرەکەتا زانینێ و مفایێ وێ د دنیا و ئاخرەتێدا.

تشتێ سێیێ، یێ د فەرمۆدەیێدا هاتی، دووندەهەکا باشە (چ کوڕ چ ژی کچ)، کو مرۆڤێ مری ل پشت خوە هێلابت، و پشتی مرنا دەیبابان، دەستێن دوعایێ بلند بکەت و داخوازا لێبۆرینێ بۆ وان ژ خودێ بکەت. بێ گومان، هندی دووندەهە، هەر بەر و بەرهەمێ دەیبابانە. پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((أو ولد صالح يدعو له)).

ئانکو: دووندەهەکا باش کو مری ل پشت خوە هێلابت و بەردەوام دوعایان بۆ بکەت. چونکی دووندەها کێرنەهاتی، کێری خوە نائێت، ڤێجا چاوا دێ پیتەیی ب دەیبابێن خوە کەت و ل دووڤ خێرا وان گەڕت. ئەڤە ئیشارەتێ بۆ هندێ ددەت، کو گرنگ ئەوە مرۆڤ دووندەها خوە، باش پەروەردە بکەت، دا د ژیان و مرنێدا مفا ژێ بگەهتێ. گۆتنا

پێغەمبەری یا بۆری، ئیشارەتە بۆ هندێ، کو دوعا بۆ دەیبابان یان بۆ هەر ئێک ژ کەس و کار و نێزیکان، چێترە ژ هندێ مرۆڤ عیبادەتەکی بکەت و بۆ وان بکەتە خێر، چونکی پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) نەگۆتییە: یان دووندەهەکا باش نڤێژان بۆ بکەت یان رۆژییان بۆ بگرت، یان خێران بۆ بکەت. هەر چەندە ناڤەرۆکا فەرمۆدەیێ ل دۆر کارییە. و ئەگەر کارێ مرۆڤی بۆ دەیبابان پشتی مرنا وان، ژ کارێن سوننەت با پێغەمبەر دا وێ چەندێ دیار کەت.

هەر وەسا دوعایا مرۆڤی بۆ دەیبابان چێترە ژ هندێ مرۆڤ تەسبیحان بدەت یان قورئانێ بخوونت یان نڤێژان بکەت و خێران بدەت و خێرا وان بۆ دەیبابێن خوە بکەتە دیاری. و مرۆڤ ب خوە پێتڤی وی کارێ باشە. بلا کارێ باش بۆ خوە ب خوە بکەت، و هەر دوعایەکا بڤێت بلا بۆ دەیبابێن خوە بکەت، و رامان ژ گۆتنا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن): ((دووندەهەکا باش کو مری ل پشت خوە هێلابت و بەردەوام دوعایان بۆ بکەت)) ئەو نینە، ئەگەر غەیری دووندەها وی دوعایێ بۆ بکەت، ئەو مفایی ژێ نابینت.. نە، بەلکو دوعایا برایێ تە یێ موسلمان، ئەگەر خوە یێ نێزیکێ تە نەبت ژی، بۆ تە ب مفایە. خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴾ (الحشر : ١٠). خودایێ مەزن ئەڤ سالۆخەتە دا بال ڤان مرۆڤان، کو ئەو دوعایێ بۆ خوە و بۆ برایێن خوە یێن باوەردارێن بەری خوە دکەن، و ئەڤە ژ برایێن ساخ و مری دگرت،و پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ عَلَى جِنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلًا لَا يُشْرِكُونَ بِاللهِ شَيْئًا إِلَّا شَفَّعَهُمُ اللهُ فِيهِ)). ئانکو: نینە موسلمانەک بمرت،و چل مرۆڤێن باوەردار ژ ئەوێن چو هەڤپشکان بۆ خودێ چێ نەکەن،ب کارێ وی رابن، ئەگەر خودێ وان بۆ وی نەکەتە مەهدەرچی. ل ئێرە پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دیار دکەت، کو مری مفایی ژ دوعایا وان کەسان دبینت، ئەوێن نڤێژێ ل سەر دکەن.

و گۆتنا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ئەوا د فەرمۆدەیا بۆریدا هاتی: ((أو ولد صالح يدعو له))، ل سەر هندێیە کو کورِ یان کچا باش و قەنج کو پارچەیەکە ژ دەیبابێن خوە، هەچکو ئەو دەیباب ب خوەنە، ژ بەر هندێ پێغەمبەری گۆت: ((إنقطع عمله إلا من ثلاث)) کارێ وی مرۆڤی ب دووماهی دئێت.. ل ئێرە، پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن)، دوعایا دووندەهی بۆ دەیبابان، ژ کارێ دەیبابان ب خوە هژمارت.

## پسیار:

١- ئەو چ کار و کریارن مرۆڤ پشتی مرنا خوە، مفایی ژێ دبینت؟

٢- بۆ چ دووندەهـ (چ کورِ چ ژی کچ) ژ کار و کریارێن دەیبابێن خوە، دئێتە هەژمارتن؟

٣- مەرەم ژ زانینا مفادار یان مفا ژێ بێتە وەرگرتن، چیە؟

## بزاڤ و چالاکی:

ب هاریکارییا مامۆستایێ خوە، ڤێ گۆتنا خودایێ مەزن شرۆڤە بکە:

﴿ وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴾.

هەر وەسا ڤێ گۆتنا پێغەمبەری ژی (سلاڤ لێ بن) شرۆڤە بکە:

((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ عَلَى جِنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلًا لَا يُشْرِكُونَ بِاللهِ شَيْئًا إِلَّا شَفَّعَهُمْ اللهُ فِيهِ)).

## وانەیا چارێ

# برایینی و پێکڤەژیان د ئیسلامێدا

**نەوزادی** پسیارا هەڤالێ خوە سەرداری کر، دا بۆ پیچەکێ بەحسێ پێکڤەژیانێ د ئیسلامێدا بکەت.

**سەرداری** بەرسڤا وی دا و گۆت: ئیمامێ مزگەفتا مە، خوتبەیا خوە یا ڤێ ئەینییێ بۆ بابەتێ (برایینی و پێکڤەژیانێ) تەرخانکربوو و تێدا گۆت: ئیسلام ئەو دینە یێ خودایێ مەزن بۆ پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) هنارتی، دەمێ قورئان ب رێکا وەحییێ بۆ ئینایە خوارێ. ئیسلام ئەو پەیام و نامەیا تەڤگرا ئەسمانییە، ئەوا ب ئەنجامدانا وەکهەڤی و یەکسانییێ د ناڤبەرا هەمی نفش و مللەت و ئووجاخاندا، خێر و خوەشی و باشی بۆ مرۆڤی بەرچاڤ کری و رژدی ل سەر ئێکبوونا مرۆڤاتییێ کری، و پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) ئەڤ گازییا ئێکبوونێ، ئەوا داخوازا برایینی و هەڤگورییێ دکەت، گەهاندییە مە، و داخواز ژ مە کرییە، کو ئەم ب ئێک چاڤی بەرێ خوە بدەینە هەمی پێغەمبەران و فەرق و جودابییێ نەئێخینە ناڤبەرا وان، و ب بنەمایێن خوە یێن بنەجهـ رێک بۆ هەڤگوری و برایینیا مرۆڤاتییا جیهانی خوەشکرییە، و ئەڤە ئەو بناخە و بنیاتێ موکوم و بنەجهە، ئەوێ هەڤبەندییا مرۆڤێ موسلمان ب برایێ وی یێ موسلمان ڤە گرێ ددت: ((لَا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى أَعْجَمِيٍّ وَلَا لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ إِلَّا بِالتَّقْوَى)) ئانکو: کەسێ عەرەب ب سەر کەسێ نەعەرەب و کەسێ نەعەرەب ب سەر کەسێ عەرەب نائێتە سەرئێخستن، ئەگەر ب رێکا تەقوادارییێ نەبت.

و ئیسلامێ داخوازا هێلانا دژمناتییێ کرییە، و کاکلکا مرۆڤانییێ د ئیسلامێدا لێبۆرینە، ئیسلامێ لێبۆرین کرییە بنیاتەکێ موکوم بۆ گرێدانا هەڤبەندییێ د ناڤبەرا مرۆڤاندا، دا پێکڤە ب برایینی و ڤیان بژین. و خودایێ مەزن ژی داخوازا هندێ ژ مە دکەت، دەمێ دبێژت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات : ١٣). و ئیسلامێ ل دووڤ نیشادانێن خوە یێن دلۆڤان، بناخەیێن هەڤناسین و برایینی و ئێکبوونێ د ناڤبەرا مرۆڤ و مللەتاندا دانایە.

## دان و ستاندن:

١- پەیاما ئەسمانی چیە؟

٢- فەرمۆدەیەکا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بینە، داخوازا برایینییێ بکەت.

## بزاڤ و چالاکی:

ڤان ئایەتێن پیرۆز ژ بەر بکە:

﴿ ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ ﴿١٢٦﴾ ﴾ (النحل: ١٢٥-١٢٦).



## وانەیا پێنجێ

# دادپـــەروەری

خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ إِنَّ الله يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ (النحل : ٩٠).

ئەڤ ئایەتە بەحسێ بنەمایێن پەیاما خودایی دکەت:

١- دادپەروەری.

٢- باشیکرن.

٣- قەنجیکرن د گەل کەس و کاران.

## بنەمایێ ئێکێ:

# دادپەروەری

دادپەروەری ئانکو (هەڤسەنگی د سەرەدەری و دان و ستاندنێدا)، هەر وەسا (وەکهەڤی و یەکسانی د پێکئینان و بەرەڤانیکرنێدا)، دادپەروەری بناخە و بنیاتە د چاڤدێریا بەرپرساندا بۆ کەسێن پێتڤی. و سێ ڕەنگێن دادپەروەرییێ هەنە:

١- دادپەروەری د ناڤبەرا مە و خودێدا، کو (ئەم وان باشییان بکەین یێن خودێ فەرمان پێ دایی، و خوە ژ وان خرابییان بدەینە پاش، یێن وی فەرمان ب نەکرنا وان دایی).

٢- دادپەروەری د ناڤبەرا مە و دەروونێ مەدا، ئانکو (گرتنا نەفسێ ژ تەمەعی و دلچوونان و رازیکرنا وێ ب قەناعەتێ).

٣- دادپەروەری د ناڤبەرا مە و خەلکیدا، ئەو ژی ئەوە (ئەم شیرەتێن باش ل خەلکی بکەین و خیانەتێ ل وان نەکەین و نەخوەشییێ نەگەهینینێ، و کار و کریارێن مە ئاشکەرا و نەپەنی وەکی ئێک بن).

### - دادپەروەری د فەرمانانىدا:

خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ﴾ (النساء: ٥٨).

خودایێ مەزن، بەرژەوەندێن خەلکی وەک ئەمانەت کرینە د دەستێ دادوەراندا، ڤێجا دڤێت ئەو د بڕیار و فەرمانێن خوەدا، ل دووڤ دادپەروەرییێ بگەڕن و چاڤێن خوە ژێ نەگرن، و یەکسانییێ د ناڤبەرا خەلکیدا ئەنجام بدەن و د دادگەهێن خوەدا،

فەرق و جوداهیێ نەکەن، دا چاڤێن چو مەزن و دەستهلاتداران نەچنە تاگیرییا وان و چو بێ دەستهلات ژی ژ دادپەروەرییا وان بێ هیڤی نەبن. کەسێ دادوەرییێ د ناڤبەرا خەلکیدا دکەت، دڤێت ل سەر خوە و بێ لەزکرن دۆزان ڤەکۆلت و تەرەفداری و تاگیرییا ئالییەکێ نەکەت ل سەر حسێبا یێ دی. هندی دادپەروەرییە بناخە و بنسترا فەرمانڕەوایی و دەستهلاتییە.

- دادپەروەری د شاهدەدانێدا:

أ–دڕاستا دوژمنیێدا: خودایێ مەزن دبێژت: ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ (المائدە: ٨).

دڤێت مرۆڤ شاهدەدانا خوە ب دورستی و بۆ کنارێ خودێ بدەت، نە ژ بۆ مەرەمەکا دنیایی، چ ئەو شاهدەدانە ل سەر ئێکێ بت، چ ژی بۆ وی بت، و نابت دوژمناتییا مە بۆ کەسەکی یان کۆمەکێ، مە د بەر هندێڕا بکەت، ئەم پشتا خوە بدەینە دادپەروەرییێ، دڤێت کانێ چاوا ئەم دادپەروەرییێ د گەل هەڤالان دکەین، وەسا ئەم وێ د گەل نەیاران ژی بکەین. دادپەروەری نێزیکترین تشتە ئەم پێ گوهدارییا خوە بۆ خودێ دیار بکەین و خوە پێ ژ کەرب و نەڕازیبوونا وی بپارێزین.

ب – د ڕاستا کەس و کار و لێزمانێدا: خودایێ مەزن دبێژت: ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى﴾ (الأنعام: ١٥٢).

ئانکو: ئەگەر هەوە گۆتنەک یان شاهدەییەک دا، پێتڤییە هوون وێ ب دادپەروەری بدەن، ئەگەر خوە ئەوێ شاهدەیی ل سەر دئێتەدان، نێزیکێ هەوە ژی بت، چونکی زۆرداری و شاهدەزووری بەرزەکرنا مافانە و خیانەتە د ئەمانەتێدا.

و دڤێت ئەم بزانین کو ب دادپەروەرییێ ب تنێ، ئێکگرتن د ناڤ جڤاکێدا پەیدا نابت، چونکی د جڤاکێدا، نەمازە د وارێ ماف و ئەرکاندا جوداهییەک هەیە د ناڤبەرا ئەندامێن هەر جڤاکەکێدا و وەکهەڤی ب ئاوایەکی هەڤسەنگ نینە، ژ بەر هندێ ئەم پێتڤی بنەمایێ دوییێنە کو باشیکرنە.

## بنەمایێ دویێ:

# باشیکرن

باشیکرن (گەهاندنا خێرێیە بۆ خەلکی و گەهشتنا تامامیا کریارێن دین و دنیاییێیە)، ئانکو گەهشتنا سنۆرێ شارەزایی و تامامییێیە، د هەر کارەکیدا کو ب مەڤە گرێدایی بت، چ کریار بن چ ژی پەرستن.. و ئەم د کار و کریارێن خوەدا، ل سنۆرێ ئەرکێ فەرمان پێ

هاتییە دان ڕانەوەستین، بەلکو چاڤێ مە ل چێترییێ بت -ئەم ل سەر ب سەرییێ ڕانەوەستین- و هەر ئێک ژ مە قەنجییێ د دەرهەقێ غەیری خوەدا بکەت، و خێر و مفا بۆ ئێکدو ژ بەرێ هەمییان ڤە بێتە دارێتن، چونکی ئەو دەربڕینەکا ئاشکەرایە ژ هەست و پشکدارییەکا دلسۆز د ڕامانا مرۆڤاتییێدا، پشتی دادپەروەرییێ، ئەو ژی وەک بناخە و بنیات بۆ دانەپاشا بەربوونەئێک و دوژمناتی و لێکدانێ د ناڤ جڤاکێدا.

## بنەمایێ سێیێ:

# قەنجیکرن د گەل کەس و کاران

فەرمانا ل مە هاتییەکرن کو ئەم کەس و کارێن خوە ژ وی تشتی بێ بار نەکەین ئەوێ خودێ دایە مە، ئەگەر خوە ب مەرەما باشیکرنێ ژی بت، چونکی ئەو ڕێکە بۆ گرێدانا بنەمالێ ب هەڤبەندییا دلپێڤەیی و دۆستینی و هاریکارییێ، و هەر دەمەکێ هەڤبەندی د ناڤبەرا کۆمەکا نێزیکی ئێک و ئێکدوناسدا ل سەر ڤان سالۆخەتان چێبوو، ژین و ژیارا وێ دێ ڕێکا قەنجییێ گرت و دێ ڕێکا خوە ل سەر خرابییێ گوهێزت. و ب ڤان هەر سێ بنەمایان (دادپەروەری، باشیکرن، قەنجیکرن د گەل کەس و کاران) سیستەمەکێ جڤاکی یێ ب هێز دێ پەیدا بت، ئەگەرێن ژێکڤەبوون و لێکدانێ تێدا دێ لاواز بن.

و کەسێن ئەڤ هەر سێ سالۆخەتە (دادپەروەری، باشیکرن، قەنجیکرن د گەل کەس و کاران) ل نک هەبن، دێ زانت کو ئەڤە کلیلێن ژین و ژیارەکا باشن، و ئەو ستوونن یێن بەختەوەری و خوەشییا خەلکی -چ کەت و چ کۆم- ل سەر ڕادوەستت، و ئەون زکرەشییێ ژ سنگان دئیننە دەر و دل و دەروونان پاک و پاقژ دکەن.

## دان و ستاندن:

١- دادپەروەرییێ پێناسە بکە و جوونێن وێ دیار بکە.

٢- ئەرێ شاهدەدان دڤێت یا چاوا بت، ئەگەر ئەو یێ شاهدەیی بۆ دئێتە دان دوژمنێ مە بت؟ ئاخڤتنا خوە ب دەقەکێ قورئانی پەسند بکە.

٣-ئەگەرێن ئەڤێن ل خوارێ دیار بکە:

أ- فەرمانا ل مە هاتییەکرن کو ئەم مرۆڤ و کەس و کارێن خوە ژ وی تشتی بێ بار نەکەین یێ خودێ دایە مە.

ب- ژ بەر چ دڤێت باشیکرن بگەهتە ڕادەیا شارەزایی و چێترییێ؟

## وانەیا شەشێ

# جهئینانا سۆز و پەیمانێ

خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ وَلَا تَنْقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ (النحل: ٩١).

جهئینانا پەیمانا خودێ، جهئینانا وێ سۆزێیە یا ڕازیبوونا خودێ و دینێ وی تێدا، سۆزەکا نە چو زیان بۆ کەسێ ژێ چێ دبت، و نە مرۆڤی پال ددەتە گونەهەکا وەکی پشتەڤانییا نەهەقی و زۆرداریێ، یان وەرگێڕانا خەلکی ژ ڕێکا خودێ.

جهئینانا پەیمانەکا وەکی ڤێ، ب دورستی سەخمەراتی وێ هەڤبەندییا هەڤپشک دئێتە کرن، ئەوا د ناڤبەرا کەسێ پەیمانێ ددەت و یێ پەیمان بۆ دئێتەداندا. و دڤێت ئەو پەیمان بێتە جهئینان، ئەوا د دەمێ دانێدا، مرۆڤ خودێ ل سەر دکەتە شاهد، چونکی خودێ دێ پسیارا وێ پەیمانێ کەت، ل سەر جهنەئینانا پەیمانا دایی و حسابێ ژی دێ د گەل کەت.

جهئینانا پەیمانا خودێ ژ سالۆخەتێن کەسێن ئاقلدارە، خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ . الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللهِ وَلَا يَنْقُضُونَ الْمِيثَاقَ ﴾ (الرعد:١٩–٢٠).

سالۆخەتێ وان وەسا هاتەدان، کو وان باوەری ب پەیمانا خودێ هەیە و ئەو ژێ پشتڕاستن، و فەرمانا وی ب جهـ دئینن و خەمسارییێ تێدا ناکەن. ئەڤە ژ سالۆخەتێن وان ئاقلدارانە یێن ڕێکا خودێ دگرن و ل دووڤ سەرێ خوە ناچن.

## جوونێن جهئینانا پەیمانێ:

١- جهئینانا گرێبەستان: خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ ﴾ (المائدة: ١).

ئانکو: وان سۆز و پەیمانان ب جهـ بینن ئەوێن هەوە داین، و هەوە جهئینانا وان ئێخستییە د ستویێ خوەدا. و بناخە و بنیاتا گرێبەستان د ئیسلامێدا (گرێبەستا دئێتە دان، جهئینانا وێ ئەرکە ل سەر هەر باوەردارەکی، ب مەرجەکێ چو ڕێگر د ڕێکا جهئینانا وێدا نەبن) و ئەڤ گرێبەستە:

أ– یان د ناڤبەرا مرۆڤی و نەفسا وی ب خوەدایە، وەکی: (سووندا ل سەر کرنا کریارەکا دورست).

ب- یان ژی د ناڤبەرا خودێ و مرۆڤیدایە، وەکی: (فەرمانێن شەرعی وەکی نڤێژێ و زەکاتێ..).

ج- یان ژی د ناڤبەرا مرۆڤی و غەیری ویدایە، وەکی: هەڤپشکاتییێ (شریکاتییێ).

٢- کێشان و پیڤانا دورست و تمام: خودێ دبێژت: ﴿ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾ (الاسراء: ٣٥).

هەر وەسا خودێ داخوازێ ژ مە دکەت کو د دەمێ فرۆتنێدا ئەم کێشان و پیڤانا خوە دورست و تمام بکەین، و تەرازوویا خوە خوار نەکەین، چونکی دورست کێشان و پیڤان، د خێر و بەرژەوەندا دنیادارییا مە دایە، و بازارا مە خوەش دکەت و بەرێ خوە ددەتێ، و د سەر ڤێ هەمیێرا، دبتە جهێ سوپاسکرنەکا جوان، ئەڤە ژ بلی هندێ کو د ئاخرەتێدا، ئەنجاما وێ چێتر و باشتر و جوانترە، و خەلاتەکی مەزن ب دووڤەیە.

## دان و ستاندن:

١- جهئینانا پەیمانا خودێ پێناسە بکە، پاشێ سالۆخەت و نیشانێن وێ دیار بکە؟

٢- گرێبەست د ئیسلامێدا چیە؟ و چەند جوون ژێ هەنە؟

٣- (کێشان و پیڤانا دورست و تمام، د خێر و بەرژەوەندا دنیادارییا مە دایە) ژ بەر چ؟

## وانەیا حەفتێ:

# ڕێزگرتن د ئیسلامێدا



ڕێزگرتن د ناڤبەرا خەلکیدا تشتەکی پێدڤی و باشە، و ژ سالۆخەتێن موسلمانانە، و ژ وان سنج و بهایانە ئەوێن تایبەت ب مرۆڤی ڤە.

و ئەڤەیە پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) د ڤێ فەرمۆدەیا پیرۆزدا بەرێ مە ددەتێ، و ژ مە دخوازت کو ئەم خوە ڤان ڕەفتار و ڕەوشتێن هێژا ل نک خوە پەیدا بکەین، و دیار دکەت کو هەر خۆرت و گەنجەکێ ژ بەر پیراتی و نەچارییێ، قەدرێ پیرەمێرەکی یان پیرەژنەکێ بگرت، خودایێ مەزن ڤێ باشیکرن و قەنجیيا وی دێ لێ زڤرینت، و دێ کەسەکی د دەمێ نەچاری و پیراتییا ویدا وەسا لێ کەتە خودان کو قەدرێ وی بگرت.

پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) کاکلکا قەدرگرتن و ڕەوشەنبیرییا ڕێزگرتنێ کرییە پشکەکا بنیاتی ژ پرۆگرامێ ژین و ژیارا ڕۆژانە.

ب ڕێزگرتن و قەدرگرتنێ ئەم دێ چینە د دلێ خەلکیدا، و دێ ڤیان و قەدرگرتنا وان ب دەست مە ڤە ئێت. و دڤێت کەسێن باوەردار د ڤێ واریدا نموونە بن و چاڤ ل وان بێتەکرن، و ئەو چرایەکێ ڕوهن بن بۆ ڕێزگرتنا غەیری خوە، لەو دڤێت ئەو ڕێزێ ل ڤان بگرن:

١ - ڕێزگرتنا کەسێن دانعەمر و مەزن، ژ بەر مەزنییا ژیێ وان، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنا وَيوَقِّرْ كَبِيرَنا))

ئانکو: ئەو کەسێ دلۆڤانییێ ب بچووکێ مە نەبت، و قەدرێ مەزنێ مە نەگرت، نە ژ مەیە.

٢- ڕێزگرتنا مامۆستایی ژ بەر زانینا وی، هەر کەسەکێ زانینەکێ نیشا تە بدەت، دڤێت تو ڕێزێ لێ بگری. موسلمانێن پێشتر، باشترین نموونەبوون بۆ ڤی کارێ پیرۆز. ئێک ژ قوتابییێن ئیمامێ شافعی دبێژت: ((والله ما اجترأت أن أشرب الماء والشافعي ينظر اليّ هيبة له)).

ئانکو : ب خودێ من د خوەڕا نەددیت، د ڕوویێ شافعیدا ئاڤێ ڤەخوم، هندی ئەو یێ ب هەیبەت بوو ل دەڤ من.

٣- ڕێزگرتنا خزمەتکاران ل قوتابخانەیان ژ بەر خزمەتا ئەو دکەن.

٤- ڕێزگرتنا مێڤانی، دڤێت مرۆڤ ب ڕوویەکی گەش و خوەش ب بەر مێڤانێ خوەڤە بچت و وی باخێڤت، و جوداهییێ نەئێختە ناڤبەرا یێ هەژار و یێ دەولەمەندا.

٥- ڕێزگرتنا فەرمانبەرێن فەرمانگەهان ژ لایێ وان کەسان ڤە یێن بۆ خزمەتەکێ قەست دکەنێ، هەر وەسا ڕێزگرتنا کەسێن بۆ خزمەتەکێ دچنە فەرمانگەهان، ژ لایێ فەرمانبەران ڤە، ب ڕێکا بەرسڤدان و جهێنانا خزمەتا وان.

٦- ڕێزگرتنا بکڕان ژ لایێ دکانداران ڤە، ب ڕوویەکی گەش و بازاڕەکا خوەش. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((رَحِمَ اللهُ رَجُلًا سَمْحًا إِذَا بَاعَ، وَإِذَا اشْتَرَى، وَإِذَا اقْتَضَى)).

ئانکو: خودێ ژ هەر کەسێ نەرم ڕازی ببت، گاڤا د فرۆشت و گاڤا دکڕت و گاڤا دۆزەک د گەل غەیری خوە هەبت.

٧- ڕێزگرتنا دینداریێن سەر ب هەمی ئۆل و ئایینان ڤە و خودانێن بیر و باوەرێن جودا جودا.

٨- ڕێزگرتنا یاسایان ب ڕێکا جهێنانا وان.

خودانێن ڕێزگرتنێ، ب ڕێکا ڕێزگرتنا خەلکی دەربڕینێ ژ سنج و ڕەوشتێن خوە دکەن، و مرۆڤێ خودان ڕێز، ئەوە ئەوێ ڤەدرگرتن ل دەڤ هەبت. کەسێ ناڤزکێ وی پاقژ و بژوون ببت، لەشێ وی هەمی بەرهەڤ دبت بۆ ڕێزگرتنێ، و ڕەفتارێ وی یێ باش و جوان، دبتە دەربڕین و ڕاڤەکرنەکا کریاری بۆ ڤی سالۆخەتێ جوان. ئەگەر مرۆڤ یێ خودان ڕێز بت، د گۆتن و کریارێن خوەدا، ڕێکا شێوازێن جوان دگرت، وەکی ئەڤێن خوارێ:

١- ب زمانەکێ خوەش و پەیڤێن جوان خەلکی دئاخێڤت.

٢- ب ڕوویەکێ خوەش و گەش و بشکوڕین بەرێ خوە ددەتە خەلکی.

٣- ب جوانترین ناڤ گازی خەلکی دکەت.

٤- خوەش سلاڤی خەلکی دکەت.

٥- ب گەرمی دچتە دەستێ هەڤالان.

٦- گوهداریيا گۆتن و بیر و بۆ چوونێن خەلکی دکەت، و ئاخڤتنا وان نابڕت و سڤک وەرناگرت.

٧- ل دووڤ هەوجەییێ دەنگێ خوە بلند دکەت، چونکی بلندکرنا دەنگی ژ خوە (ژ قەستا)، بێ ئەدەبییە.

٨- هەمی دەم و وەختان، ب جوانی هەڤالینیيا هەڤالێن خوە دکەت.

٩- ژ بۆ ڕازیکرنا خەلکی، هندەک جاران کارێن خوە دهێلتە ب ڕێڤە.

١٠- دیارییان پێشکێشی برا و کەس و کارێن خوە دکەت.

١١- گەلەک ئێزا و نەخوەشییا خەلکی ل سەر خوە قەبوول دکەت و دادقورچینت.

## دان و ستاندن:

١- ڕامانا پەیڤا (شیخ) د فەرمۆدەیا پیرۆزدا دیار بکە؟

٢- پێغەمبەرێ مە موحەممەد (سلاڤ لێ بن) د فەرمۆدەیا بۆریدا چ داخوازێ ژ مە دکەت؟

٣- چاوا قەدرێ خەلکی دێ گری؟

٤- هندەک ژ وارێن ڕێزگرتن و قەدرگرتنا خەلکی بێژە.

٥- ئەو چ ئەرکە دڤێت تو د ڤان هەلوێستاندا ب جه بینی:

أ- زەلامەکێ پیرەمێر تە دیت، بار و پشتییەکێ گران ل پشتێیە.

ب- پیرەژنەک تە ل جهەکێ قەرەبالغ دیت، نەشێت خوە گەلەک ل سەر پێیان بگرت.

ج- پیرەمێرەک تە دیت، دڤێت ل جادەیێ دەرباز ببت.

د- قوتابییەکێ ژ تە مەزنتر دئاخڤت.

هـ- قوتابییەکی خوە د گەل مامۆستایی بێ ئەدەب کر.

# دلۆڤانی د ئیسلامێدا

دلۆڤانی سالۆخەتەکێ سروشتییە ل دەڤ مرۆڤی، و هەر و هەر ساخ و نەمرە د دل و هەستێ ویدا، و جهەکێ بەرفرەهـ د شەریعەتا ئیسلامێدا ڤەدگرت، و دلۆڤانییە ژ خودێ بۆ بەنییان.

پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((إنَّ اللهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ ما لا يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ، وَمَا لا يُعْطِي عَلَى مَا سِواهُ)). ئانکو: خودێ دلۆڤانە و حەز ژ نەرمی و دلۆڤانییێ دکەت، و هندی خودێ ل سەر دلۆڤانییێ ددەت، هند ل سەر توند و تیژی و غەیری وێ نادەت.

هەمی بەلگە هندێ پەسند دکەن کو دلسۆزی و دلۆڤانییەکا ب هێز د ناڤبەرا موسلمان ب خوەدا و د ناڤبەرا وان و غەیری واندا هەیە. کەس نینە ژ دلۆڤانییێ بێبار بت، لێ هەمی مرۆڤ د ڤی واریدا ئێک نینن. و ئەگەر دلسۆزی و دلۆڤانی د ناڤبەرا مرۆڤاندا نەبت، ژین و ژیار بەردەوام نابت و دێ ڕاوەستت.

هندی مرۆڤە، ڤیان و نەڤیان و کەیف و خەم و کەنی و گری و نەرمی و توندی، ئەڤە هەمی ل دەڤ هەنە و ئەو هەمی سالۆخەتێن دلۆڤانییێنە ل دەڤ مرۆڤی، و فەرە ئەم بزانین، کا ئەم دێ چاوا دلۆڤانییێ ب کار ئینین.

## چاوا ئەم دێ بەرانبەری ئێکدو دلۆڤان بین؟

١- دلۆڤانی د گەل مرۆڤی:

أ- دلۆڤانی و دلسۆزی د گەل زارۆکان: زارۆک حەز ژ دەیبابێن خوە دکەن، و خزمەتا وان دکەن و گوهدارییا ئاخفتنێن وان دکەن و سەرێ گوهدارییێ بۆ جهێینانا فەرمانێن وان دچەمینن، و دەمێ نەساخ و نەخوەش دبن، هاریکارییا وان دکەن و هەوجەیی و پێتڤییێن وان ب جهـ دئینن و وان بۆ خوە دکەنە ژێدەرەکێ باوەرییێ د وان هەمی کار و بارێن خوەدا، ئەوێن ب ژین و ژیارا وان ڤە گرێدایی.

ب- دلۆڤانییا دەیبابان: بێ گۆمان باب دلۆڤانییێ ب زارۆکێن خوە دبەت و حەز ژ وان دکەت و خوارن و ڤەخوارن و جلکان بۆ وان بەرهەڤ دکەت، و نەخشەیەکێ بۆ وان دادرێژت، کو پاشەڕۆژەکا ڕوهن و شەوقدار ل سەر ئاڤا ببت، و د بەر واندا زێدە خوە دوەستینت. زارۆک پارچەیەکە ژ جەگەرا

وی و دلێ وی هەردەم پێڤەیە و د دووڕایە. ڕۆلێ دەیکێ، وەکی یێ بابێیە و بەلکو زێدەترە ژی، نەمازە د وارێ پەروەردەکرنا زارۆکاندا. و باشترین نموونە ل سەر دلۆڤانی و دلسۆزییا دلێ بابێ د ڕاستا زارۆکێ ویدا، ڤیانا پێغەمبەرێ خودێ، یەعقووبی (سلاڤ لێ بن) بۆ کوڕێ وی یووسفی، دەمێ ژ خەمێن بەرزەبوونا ویدا چاڤ لێ تاری بووین و سپی وەرگەڕیاین، خودایێ مەزن د قورئانا پیرۆزدا دبێژت: ((وَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَا أَسَفَى عَلَى يُوسُفَ وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ)) (یوسف: ٨٤). و پێتڤییە باب دادییێ د ناڤبەرا زارۆکێن خوەدا بکەت، چونکی پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((اتقوا الله واعدلوا في اولادكم)). ئانکو: تەقوایا خودێ بکەن و دادییێ دناڤبەرا زارۆکێن خوەدا بکەن.

ج- دلۆڤانییا مێری د ڕاستا ژنکا خوەدا: مێر دلۆڤانییێ ب ژنکا خوە دبت، ئەو ژنا بوویە هەڤژین و هەڤگیانا وی، و بوویە دەیکا زارۆکێن وی، هەر وەکی خودایێ مەزن د قورئانا پیرۆزدا دبێژت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ (الروم: ٢١). پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) کەسێن ب ڤی کاری ڕادبن، ژ غەیری وان چێتر لێ کرینە دەمێ دبێژت: ((خياركم خياركم لنسائكم)) ئانکو: یێ ژ هەوە هەمییان چێتر و باشتر، ئەوە یێ چێتر و باشتر بت بۆ ژنکێن خوە. و عومەرێ کوڕێ خەتتابی (خودێ ژێ ڕازی بت) دبێژت: ((وما لي لا اصبر عليها وهي أم لاولادي))، ئانکو: ڤێجا ما بۆ چ ئەز بێنا خوە ل سەر فرەهـ ناکەم و ئەو دەیکا زارۆکێن منە.

د- دلۆڤانییا ژنێ: ژنکا مرۆڤی، دلۆڤانییا خوە بەرانبەری مێرێ خوە ب ڤیان و گوهداری و ڕێزگرتنا خوە دیار دکەت.

هـ- دلۆڤانی د گەل نێزیک و کەس و کاران: مرۆڤێ موسلمان پەیوەندییا خوە د گەل کەس و کار و نێزیکێن خوە موکوم دکەت، ب ڕێکا سەرەدان و سلاڤکرنا وان. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((اتقوا الله وصلوا أرحامكم)) ئانکو: تەقوایا خودێ بکەن و پەیوەندییێ د گەل کەس و کارێن خوە موکوم بکەن و پشتا خوە نەدەنە وان. باوەرییا مرۆڤێ موسلمان یا ب هێز وی هەردەم د بەر هندێرا دکەت و پال ددەت کو خوە د گەل وان کەسان ژی ب مرۆڤانی بت، ئەوێن پشتا خوە ددەنێ.

و- دلۆڤانی د گەل نەخوەش و نەساخان: مرۆڤێ موسلمان ژ ئێکا دلۆڤانییێ ڤە، و ب کارێ وێ دلۆڤانییا د دلێ ویدا هاتییە چاندن و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ وەرارکری، د نەخوەشی و نەساخییاندا ژی، سەرا برایێ خوە یێ موسلمان

ددەت. پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((مَنْ عَادَ مَرِيضًا، لَمْ يَزَلْ يَخُوضُ فِي الرَّحْمَةِ حَتَّى يَجْلِسَ، فَإِذَا جَلَسَ اغْتَمَسَ فِيهَا))، ئانكو: هەچیێ سەرا نەساخەکێ بدەت، دادکەڤتە د ناڤ دلۆڤانیێدا هەتا ڕوودنت، گاڤا ڕوونشت، تێدا نقۆنی دبت.

ز- دلۆڤانی د گەل کەسێن خواستەک: مرۆڤێ موسلمان هەردەم نەرمە د گەل کەسێ خواستنێ دکەت، و چاڤێ وی ل دەستێ وی، و ئەڤە ژی بەرسڤدانا گۆتنا خودایێ مەزنە: ﴿ فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ۝٩ وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ ۝١٠ ﴾ (الضحى) ئانكو: ڤێجا تو ژی ئێتیمی نەئێشینە، و کەسێ خواستەک پاشڤە نەبە.

ح- دلۆڤانی د گەل بێژنان: مرۆڤێ موسلمان دلۆڤان و دلنازکە، د ڕاستا بێژناندا، و د ڤی واریدا پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) پایەیا وان کەسێن پارە و مالی د ڕاستا واندا دمەزێخن بلند دکەت و دبێژت: ((السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ)). ئانكو: کەسێ بزاڤا خێرێ ژ بۆ بێژن و دەستتەنگان بکەت، وەکی وی کەسییە، ئەوێ د ڕێکا خودێدا خەباتێ دکەت.

خ- دلۆڤانی د گەل ئێتیمان: مرۆڤێ موسلمان د ڕاستا ئێتیماندا ژی، دلنازک و هەستنازکە، و پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) پایەیا کەسێ هۆسا بلند دکەت و دبێژت:((أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ)).پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ئاماژە ب نێزیکاتییا د ناڤبەرا تبلا شاهدەیێ و یا نیڤێدا کر و گۆت: ئەز و کەسێ سەرەگوهیا ئێتیمی دکەت د بەهەشتێدا، وەکی نێزیکاتییا د ناڤبەرا تبلا شاهدەیێ و یا نیڤێدا، نێزیکی ئێکن.

٢- دلۆڤانی د گەل گیانەوەران: ئیسلام ب چاڤێ دلپێڤەیی و لۆڤانییێ بەرێ خوە ددەتە گیانەوەران و وان ژی وەک مرۆڤان هەر وەکی د قورئانا پیرۆزدا هاتی، ب مللەت دهەژمێرت، و دیار دکەت کو خودێ ئەڤ گیانەوەرە ئێخستینە د خزمەتا مرۆڤیدا، دڤێت ئەم ژی دلۆڤانییێ پێ ببەین و بارێ ژ شیانا وان گرانتر و مەزنتر ل وان نەکەین. خەلیفە عومەرێ کوڕێ عەبدولعەزیزی، دەمێ دەوار وەستیایی دیتی، پشتیبارەکی ژ شیانا وێ مەزنتر لێ هاتییە کرن، ئینا فەرمان دا، کو خودانێ وێ بۆ دەمێ سێ ڕۆژان بێنێ بدەتێ و باری لێ نەکەت.

٣- دلۆڤانی د گەل شینکاتی و داروباران: ئیسلام شیرەتێ ل موسلمانان دکەت کو سەرەگوهییێ خوە ل شینکاتی و داروباران ژی بکەن و وان بپارێزن، و فەرمانێ ل وان دکەت، کو دارا ب بەر نەبڕن و ژ ڤێ زێدەتر ژی موسلمانان بۆ تۆڤچینی و چاندنێ هان ددەت، بەرانبەری خەلات و پاداشتەکی دابینکری ل دەڤ خودێ.

## شوونمایێن باشێن دلۆڤانییێ:

مرۆڤ ڤان بەر و بەرهەمان ژ دلۆڤانییێ دچنت:

١- دلۆڤانی مرۆڤی پال ددەت کو پەیوەندییان د گەل کەس و کار و نێزیکێن خوە موکوم بکەت و سەران ژ هەڤال و هۆگر و جیرانان نەبڕت.

٢- دلۆڤانی هاریکاری و دەستگرتنا خەلکی ل دەڤ مرۆڤی دچینت و شین دکەت.

٣- دلۆڤانی هەڤبەندییێن جڤاکی د ناڤبەرا خەلکیدا ب هێز دئێخت و نووژەن دکەت و ڤەدوەژێرت.

٤- دلۆڤانی مرۆڤی سەرنەرم و دلنازک دکەت و بەرێ وی ژ توند و تیژییێ وەردگێرت.

٥- دلۆڤانی د گەل کەس و کار و نێزیکان، ڕزقێ مرۆڤی زێدە دکەت و دبتە ئەگەرێ درێژییا ژییێ خودانی. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ، أَوْ يُنْسَأَ فِي أَثَرِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ)) ئانکو: هەر کەسێ پێ خوەش بت، ڕزقێ وی بەرفرەه ببت و مرنا وی بێتە پاشئێخستن (ژییێ وی درێژ ببت)، بلا پەیوەندییێن مرۆڤانییێ د گەل کەس و کار و لێزمێن خوە موکوم بکەت.

٦- دلۆڤانی د گەل هەمی خەلکی، دبتە ئەگەرێ ب دەستڤەهاتنا دلۆڤانییا خودێ، و بەلگە ژی ئەو ئاخڤتنا پێغەمبەرییە (سلاڤ لێ بن) ئەوا دبێژت: ((ارْحَمُوا مَنْ فِي الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ)) ئانکو: دلۆڤانییێ ب وان ببن ئەوێن ل سەر ئەردی، ئەوێ ل ئەسمانی دێ دلۆڤانییێ ب هەوە بەت.

## چەند چیرۆکەک ل سەر دلۆڤانییێ:

### ١- دلۆڤانییا مرۆڤی د ڕاستا مرۆڤیدا:

زەلامەکێ ئەنساری مرۆڤەکێ هەژار و برسی برە مالا خوە و گۆتە کابانییا خوە: مە چ هەیە؟

ژنکا وی گۆتێ: مە ژ خوارنا زارۆکان پێڤەتر تشتەک د مالدا نینە.

ئینا زەلامێ وێ گۆتێ: زارۆکان ب تشتەکی ڤە مژوول بکە، گاڤا مێڤان ب ژۆر کەڤت، چرایی ڤەمرینە، و بکە تاری. زەلامێ ئەنساری د گەل کابانییا خوە، ل

تارییێ د گەل مێڤانێ خوە ڕوونشتنە سەر خوارنێ بێ کو بخون، دا مێڤان هەست پێ نەکەت کو ئەو ناخون، مێڤانێ وان خوارنا خوە خوار و خودانێ مالێ د گەل کابانییا خوە و زاڕۆکێن خوە وێ شەڤێ برسی نڤستن، گاڤا لێ بوویە سپێدە و ئەو چوویە دەڤ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن)، پێغەمبەری گۆتێ: فلان، خودێ مەندەهۆش ما ژ کارێ تە شڤێدی د گەل مێڤانی کری.

## ٢- دلۆڤانییا مرۆڤی د گەل گیانەوەری:

پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((دەمێ زەلامەک ب ڕێبارێ ب ڕێکەکێ دچوو، گەلەک تێنی بوو، ئینا بیرەک دیت، خوە داهێلا تێدا و ئاڤ ڤەخوار، پاشێ دەرکەڤت، دیت سەیەک نێزیکی دەرێ بیرێ ژ تێنادا زمان د دەڤیدا هاتییە و حلکەحلکا وییە و یێ ئاخێ دئالیست. ئینا زەلامی گۆتە خوە: ئەوا هاتییە سەرێ من ژ تێنادا، یا هاتییە سەرێ ڤی سەیی ژی، ڕابوو جارەکا دی چوو د بنێ بیرێدا، و تژی کەتەکا پێلاڤا خوە ئاڤ کر، و د لێڤەکا وێرا گرت و ب سەر ئێخست، ئاڤ پێ دا سەیی، ئینا خودێ ژ بەر ڤی کارێ وی یێ قەنج، ل هەمی گونەهێن وی بۆری)).

## ٣- دلۆڤانییا گیانەوەری د گەل مرۆڤی:

(جاحز) دبێژت: دەمێ (تاعوون) کەڤتییە ناڤ خەلکی، خەلک چوونە مالەکا کول کەڤتییە ناڤ، دیتن بێ دەنگە، هزرکرن، کەس ژێ نەڤەڕەستییە، ڕابوون دەرگەهێ مالێ دائێخستن، و بچووکەکی شیرمێژ د مالدا مابوو ساخ و ئەو پێ نەحەسیان، وەختەک ب سەرڤە چوو، هندەک هەڤپشک و کەس و کارێن وان پێڤەهاتن، هۆ دەرگەهێ مالێ ڤەکرن، دیتن بچووکەکێ د گەل جەورکێن دێهلا مالێ یارییان دکەت، گاڤا بچووکی ماکا جەورکان دیتی، ئەو ژی ب چەلەپکان بەر پێ چوو و دێهلک ل بەر ڕاوەستیا، دا چچکێن وێ بگرت و شیری ژێ بخوت. شیر گرت و خوار. تو نابێژی دەمێ ئەڤ بچووکە مایە ب تنێ و برسی بوویی، جەورک دیتینە دەیکا خوە دمێژن، ئەو ژی ژ برساندا بەر پێ چوویە و ماکێ ژی دلۆڤانی پێ برییە، هۆسا جارەکێ شیر ژێ خوارییە و پاشتر گورا خوە دایینە ئێک و فێری خوارنا شیرێ وێ بوویە.

## پسيار:

١- فەرمۆدەيەكا پيرۆز بنڤيسە ببتە بەلگە ل سەر گرنگييا دلۆڤانييێ د ئيسلامێدا.

٢- فەرمۆدەيەكا پيرۆز بينە داخوازا دادپەروەرييا بابێ بكەت د ڕاستا زارۆكاندا.

٣- فەرمۆدەيەكێ بينە ل دۆر دلۆڤانيبرنێ ب بيژنان.

## بزاڤ و چالاكى:

١- ب ڕێزگرتنا من بۆ دەيبابێن من، ئەز دێ دياركەم كو ئەز حەز ژ وان دكەم.

٢- ب گوهدارييا گۆتنێن دەيبابێن خوە، دەمێ دئاخڤن، ديار دكەم كو ئەز مرۆڤەكێ خودان هەستم.

٣- ب جهئينانا شيرەتێن دەيبابێن خوە (ل مال و ل قوتابخانەيێ) ديار دكەم كو ئەز مرۆڤەكێ ئاقلدار و خودان ڕەوشتم.

**نيشانا (دورست) ل بەر دەستەواژەيا ڕاست و يا (خەلەت) ل بەر دەستەواژەيا خەلەت دانە:**

١- باب بۆ زارۆكێن خوە نەخشەيەكێ وەسا نادانت كو پاشەڕۆژەكا ڕوهن بۆ وان مسۆگەر بكەت.

٢- مرۆڤێ موسلمان ژ ئێكا دلۆڤانييێ ڤە، پشتا خوە نادەتە كەسێ پشتا خوە داييێ.

٣- مرۆڤێ موسلمان هەلويستەكێ نەرم د گەل خوازخوازۆكێ ئەنجام ددەت و كەربێن خوە نائاڤێتێ.

## ئەگەرێن گونجايى بۆ ئەڤێن خوارێ ديار بكە:

١- كەسێ خودان ڕێز ل دووڤ هەوجەييێ دەنگێ خوە بلند دكەت.

٢- كەسێ خودان ڕێز هندەک جاران پشتا خوە ددەتە بەرژەوەندێن خوە يێن تايبەت.

٣- خەليفە عومەرێ كوڕێ عەبدولعەزيزى داخوازا بێندانا هندەک هەسپان كر بۆ دەمێ سێ ڕۆژان.

**بەرسڤا ڕاست و دورست د ناڤبەرا دو کڤانان‌دا بۆ ئەڤێن خوارێ هلبژێرە:**

١- ............ پێغەمبەر ژ خەمێن کوڕێ خوەدا چاڤ لێ تاری بوون (یووسف، یەعقووب، شوعەیب).

٢- مرۆڤێ موسلمان ............. د گەل ئێتیم و سێوییان (دلنەرمە، دلڕەقە).

٣- ئەز بالندەیان بێ خوارن و ڤەخوارن زیندان ............ (ناکەم، دکەم).

**ستوونا ئێکێ ب ئاوایەکی گونجایی ب ستوونا دویێ ڤە بکە:**

| | |
|---|---|
| ١- دلۆڤانی ل دەڤ مرۆڤی | د گەل قوتابییێن خوە دکەت. |
| ٢- موسلمانێ خودان ڕێز خەلکی | هاریکارییێ پەیدا دکەت. |
| ٣- مامۆستایی هەستەکێ بابانە هەیە سەرەدەرییێ پێ | ب زمانەکی خوەش دئاخێڤت. |

## وانەیا نەهێ:

# ژ سەرهاتیێن پێغەمبەران

## ١- بێنفرەهیا ئەییووبی

خودایێ مەزن دبێژت: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِنْ ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ ﴿٨٤﴾﴾ (الأنبياء).

ئەییووب (سلاڤ لێ بن) ژ وان پێغەمبەرێن خودێیە، ئەوێن ناڤێن وان د قورئانا پیرۆزدا هاتی، و هەمی خەلک دنیاسن و گۆتن ل سەر بێنفرەهیا وی هاتییە دانان، دبێژن: (بێنفرەهیا ئەییووبی).

ئەییووب (سلاڤ لێ بن) ژ دووندەها یووسفییە (سلاڤ لێ بن) ژنەکا دەهمەنپاک بۆ خوە ئینابوو، ئەو و ژنا خوە پێکڤە ل دەڤەرا (حۆرانێ) دژیان، و خودێ گەلەک کەرەم د گەل وی کربوون، گەلەک کوڕ و کچ دابوونێ، و گەلەک ئەرد و زەڤی ب ڕزقێ وی کربوون، بۆ خوە دچاندن، و خوەشترین و باشترین بەر و بەرهەم پێڤە دهاتن. هەر وەسا گەلەک پەز و دەوار و پێرهـ دابوونێ، ب هزاران سەرێن چێلان، و ب هزاران پەز و بزن و حێشتر دابوونێ. و د سەر ڤێ مالداریێ هەمییێ ڕا، خودێ پێک و پایەیا وی بلندکر و کرە پێغەمبەر ژێ. خەلکی قەستا مالا وی دکر و مالا وی بووبوو قیبلەگەها ژار و دەستتەنگان، نەمازە پشتی وان دیتین دەستێ وی بۆ هاریکاریێ درێژە و ڕێکا مالا خوە ژ وان ناگرت، و نەشێت مرۆڤێ ژار و دەستتەنگ ببینت و بێ مراد ڤەگەڕینت. مەردینیا وی گەهشتە ڕادەیەکا وەسا وی خوارن نەدخوار ئەگەر دەستتەنگ و برسییەک ل سەر سفرا وی و ب ڕەخ ڤە ڕوونشتی نەبا.. ئەها ئەییووب (سلاڤ لێ بن) هۆسا دژیا. و هەردەم وی شوکوردارییا خودێ دکر و بەرێ خەلکی ددا هەر خێرەکێ و بەرێ وان ژ هەر خرابییەکێ وەردگێڕا.

د ناڤ ڤێ ژیێ تژی خوەشی و بەرفرەهیدا، و پشتی ژین و ژیارەکا تەنا و ئێمن، و هەردەم شوکورداری ل سەر لێڤێن ئەییووب پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) و کوڕ و کچێن وی بوو، ژ بەر وان کەرەمێن خودێ ب زێدەیی د گەل کرین، و پالە و کۆلەیان ژێ ل ئەرد و بیستانێن وی کارێ خوە دکر، و ژنا ئەییووب پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) دستار دهێرا، ل ڤێ دەمێ هەمی تێدا دلخوەش و شاد و هەر ئێک ب کارێ خوە ڤە مژوول، ژ نشکەکێڤە و

بێ دەستوورخواستن، دەردەسەری و بەلا و نەخوەشییان سەرهلدا و ئـەزموونێ دەست پـێ کر. ب بـەز و ب بێنـەکا سوار و هـەوارکی پالەیـەک ب سـەر مـالا ئـەییووب پێغەمبەریـدا (سلاڤ لێ بن) داگەڕیا و یێ دکەتە گازی:

– ئەزبەنی.. هەی پێغەمبەرێ خودێ؟!!

– کوڕۆ چ قەومییە؟ باخڤە.

– کوشـتن.. هـەمی هـەڤالێن مـن کوشـتن.. شـڤان و جۆتیـار هـەمی هاتنـە کوشـتن و خوونا وان ل سەر ئەردی هاتە ڕێتن..

ئەییووب پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆت: ((إنا لله وإنا اليه راجعون – ئەم هەمی ملک و مالێ خودێینە و ئەم هەمی دووماهییێ دێ ب بال وی ڤە زڤڕین)) ژ ڤێ زێدەتر نـەگۆت و ڤەنەگێڕا.

خودێ ڤیا ئەییووبی پشتی وان هەمی خوەشییان، بجەرببینت.

ڕۆژا پاشتر، برووسییەکێ ل زەڤییەکا وی دا و سۆت.

ژنا ئەییووب پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆت:

– ئەڤە چ هۆ بەلا و نەخوەشییان دا دووڤ ئێک؟!

ئەییووبی لێ زڤڕاند و گۆتێ:

- عەبدا خودێ.. ئەڤە حەزکرنا خودێیە.. ئەڤە دەمێ ئـەزموون و جەربانـدنێیـە.. چـو پێغەمبەر نەهاتینە، خودێ نەجەرباندبن.

ئەییووبی (سلاڤ لێ بن) سەرێ خوە سەرئەفرازکر و ب پارپارڤە گۆت:

- خودێوۆ تو بێنفرەهییێ بدەیە من.

ڕۆژا پاشتر کارەساتەکا دلسۆژتر قەومی، خوە دلێن ژ پیلایی ژی هاتینە چێکرن خـوە ل بەر نەدگرت.. هەمی کوڕ و کچێن ئەییووبی پێکڤە مرن، پێکڤە ل سەر سفرا خـوارنێ کـۆم و ڕوونشتی بوون، و بان ب سەر واندا هات و هەمی مانە د بن ڤە و مرن..

ل ئێـرە کارەسـات و نەخوەشـییا ئـەییووبی (سـلاڤ لـێ بـن) مـەزنتر لـێ هـات و جەگەرا وی د چاڤنەڤاندنەکێدا ژێ هاتە ستاندن..

نەخوەشی ل ئێرە ژی ڕانەوەستیا، جانێ ئەییووبی ب خوە ژی گرت..

لەشێ وی تێکدا بوونە پرسک و کوونێر..

و ژ مرۆڤـەکێ لەشسـاخ و سـاخلەم و ڕووخـوەش، بـوو مرۆڤـەکێ لاواز و لەغـەر و ڕووکرێت، کو هەمی ژێ برەڤن و کەس خوە لێ نەکەتە خودان. کەس د گەل نەما ژ ژنا وی

یا دەهمنپاک و باش پێڤەتر.. ئەو مالا هند ب دەنگ و دۆر و قەرەبالغ، بوو مالەکا وێران و ڤالا، نە مال تێدا ما، نە کورِ و کچ و نە ژی ساخلەمی..

ئەییووب پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ژنکا خوە ئاگەهدار کر، کو ئەڤە حەزکرنا خودێیە، و دڤێت ئەم خوە بسپێرینە فەرمانا وی و خوە ل بەر ڤێ ئەزموونێ بگرین و ژێ نەرەڤین.

شەیتانێ لەعنەتی بزاڤ و بەرگەریان کر، خوە بگەهینتە دلێ ئەییووبی و گۆمان و وەسواسێ ژ هەمی رەخان بێختێ، گۆتە ئەییووبی: ئەییووب! تە چ کرییە هەتا ئەڤە هەمی بێتە سەرێ تە، نە کورِ و کچ بۆ تە بمینن، نە مال و ملک و نە ساخلەمی؟! ئینا ئەییووبی (سلاڤ لێ بن) خوە ب خودێ ژ شەیتانی پارازت.. و تفکرە شەیتانی و ب هندێ رێک ل بزاڤ و بەرگەریانا وی گرت. ژنا وی ژی هەمان تشت کر و رێک ل گۆمان و وەسواسا شەیتانی گرت، و شەیتان بێ هیڤی کر. و هندی بەلا و نەخوەشی مەزنتر لێ دهات، بێنفرەهیا ئەییووبی (سلاڤ لێ بن) پتر لێ دهات.

هەر چەندە ژنا ئەییووب پێغەمبەری گەلەک داخواز ژ زەلامێ خوە کر کو دوعایێ ژ خودێ بکەت، دا ئەو ڤێ بەلایا ئەڤە هندە قەدەر سالن بەرهنگاری وان بوویی، ژ سەر وان بدەتە رەخەکێ، لێ د گەل هندێ ژی ئەو ل بەر نەدهات. هەمی بەلا و نەخوەشی داقورچاندن و خوە ل بەر بێبەختییێن خەلکی گرت.. بەلێ کریارا ژنا وی کری، ئانکو فرۆتنا هەردو کەزییێن خوە بەرانبەری نانی، ئەو زێدە هەرشاند.. بەرێ خوە دا ئەسمانی و گۆت: خودێوۆ ب راستی شەیتانی ئەزێ بەرهنگاری زەحمەتێ و ئێزایێ کریم.. خودێوۆ خێر و باشی هەمی ئەون ئەوێن د دەست تەدا و دووماهیا هەر کار و کریارەکێ هەر ب بال تەڤە دزڤرت.. دلۆڤانییا تە ب سەر هەر تشتەکێ کەڤتییە و بەری هەر تشتەکی دئێت، ئەزم بەندەیێ تە یێ لاواز و من هیڤی ژ تە نەبرییە.. خودێوۆ ئێش و نەخوەشی و بەلایێ ئەزێ هنگاڤتیم و کەس ژ تە دلۆڤانتر نینە هەوارا خوە بگەهینمێ و قەست بکەمێ. خودایێ مەزن ل سەر زمانێ ئەییووبی دبێژت: ﴿ وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴾ (ص: ٤١). ل ئێرە رۆناهییەکا نازک ب سەر جهێ ئەییووب پێغەمبەریدا باری، و بێنەکا خوەش دەر و دۆرێن وی گرتن، ئەییووبی هند دیت، ملیاکەتەک ژ ئەسمانی ب سەردا هاتە خوارێ و سلاڤ کرێ و گۆتێ: ((ئەییووب، تو بەندەیەکی جوامێر و گوهداری، خودایێ مەزن سلاڤان بۆ تە دهنێرت و دبێژت: دوعایا تە هاتە قەبوولکرن، و خودێ خێرا سەبرکێشانێ دێ دەتە تە.. ﴿ ارْكُضْ بِرِجْلِكَ هَذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ رَحْمَةً مِنَّا وَذِكْرَى لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿٤٣﴾ ﴾ (ص: ٤٢ و ٤٣). ئانکو: پێ خوە ل ئاخێ بدە.. و خوە د کانییا تەزی هلینە و ژێ ڤەخوە، ب ئانەهیا خودێ ئێش ل دۆر تە نامینت و دێ ساخلەم دەرکەڤی. ملیاکەت غەوارەبوو، و ئەییووب پێ حەسیا کو رۆناهییەک ب سەر دلیدا هاتە دارێتن و دلێ وی رۆهن کر، ئینا وی پێ خوە ل دووڤ داخوازا خودایێ مەزن، ل ئاخێ دا، کانییەکا شرین و تەزی دەربوو، ئاڤا وێ یا پاقژ تێر ڤەخوار و خوونا

ساخلەمی و لەشساخییێ د سەر و چاڤاندا گەڕییا، و لاوازی و بێخێرییا پێشتر ب ئێکجاری لێ نەما. ئەییووب پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) کراسێ نەخوەشی و لاوازییێ ژ بەر خوە کر و هندەک جلکێن تازە و جوان کرنە بەر خوە، ساخلەمی و خوەشی ژ سەر و چاڤان دپەشی، بەربەرە دەر و دۆرێن وی خوەش و گەشبوون، و خوەشی و ساخلەمییا بەرێ لێ زڤڕی ڤە، مال و حال زڤڕینە ڤە و ژین و ژیارا وی جارەکا دی ڤەژییا.

کابانییا وی هات ل مێرێ خوە گەڕییا، نەدیت. ویڤەتر چوو، زەلامەکێ تێر و تەژی و ڕووخوەش دیت، ب مەلوولی گۆتێ:

– تە زەلامێ من ئەییووب نەدیتییە.. ئەییووب پێغەمبەرێ خودێ؟!

– ئەز زەلامێ تە ئەییووبم.

– تو؟! زەلامێ من پیرەمێرەکی ڤەهەڕفتی و لاواز و نەساخە!

–نەساخی و ساخی هەردو ژ خودێنە.. هەمی تشت د دەست ویدانە.. بەلێ، خودێ حەزکر و کەرەما خوە ب سەر مندا داڕێت، و نەخوەشییا مە ب دووماهی ئینا و ساخلەمی و لەشساخییا بەرێ ل من زڤڕاندەڤە!

وی داخواز ژ کابانییا خوە کر کو ئەو ژی خوە د کانییێ هلینت، دا گەشاتی لێ بزڤڕتەڤە. وێ ژی خوە تێ ئێخست و خوە شووشت و ڤەشووشت و خودایێ مەزن ژ کەرەما خوە، کراسێ گەشی و خوەشی و ساخلەمییێ کرە بەر وێ ژی و جارەکا دی، خودێ کرنە دەیک و بابێن کوڕ و کچان و دووندەهـ ب دوو وان ئێخست.

وەک جهئینانا بۆ وێ نەدرا ئەییووب پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) دایی، کو سەد قامچییان ل ژنا خوە بدەت، جزایێ فرۆتنا هەردو کەزییان، خودێ داخواز ژێ کر، قەفتەکا (دەستکەکێ) گیایی د دەست خوە بگرت و پێ دانتە کابانییا خوە، بۆ هندێ دا سووندا خوە نەئێخت و کابانییا خوە ژی نەئێشینت، چونکی ژنەکا باش و کێرهاتی و شیرحەلال بوو، بەس هێژایی خێرێیە: ﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِبْ بِهِ وَلَا تَحْنَثْ إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴾ (ص: ٤٤).

ئەییووب پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) ئێک ژ بەندەیێن خودێ یێن سوپاسداربوو د خوەشییێدا، و یێ بێنفرەهـ و خوەگرتی بوو د بەلا و نەخوەشییێدا، ئەو ژ وان بەندەیان بوو یێن هەمی دەمان ل خودێ دزڤڕن، و خوەشی و نەخوەشی چو جاران خودێ ژ بیرا وان نابت.

هەمی خەلکی چیرۆکا ئەییووبی (سلاڤ لێ بن) زانی، و ل دەڤ وان بوو ئێقین کو نەساخی و ساخلەمی هەردو ژ خودێنە، هەر وەسا هەژاری و دەولەمەندی ژی ژ وینە: ﴿فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ (الأعراف : ١٧٦). ئانکو ڤان چیرۆکێن ڕاست بۆ وان ڤەگێڕە، بەلکو ئەو هزرا خوە تێدا بکەن.

## عیبرەت ژ ڤێ چیرۆكێ چیه؟

ژ خواندنا مه بۆ ڤێ چیرۆكێ، ئەوا قورئانا پیرۆز ئیشارەت بۆ كری، بۆ مه دیار دبت كو بێنفرەهی ل سەر نەخوەشی و بەلایێ ژ ئەگەرێن وەرگرتن و ب دەستڤەئینانا ڕازیبوون و لێبۆرینا خودایێ مەزنه، ژ بەر ڤێ چەندێ، فەرە ل سەر مرۆڤێ باوەردار، كو بێنا خوە فرەهـ بكەت، ل سەر وان نەخوەشییێن خودێ بەرهنگاری وی كرین، دا ڕازیبوون و لێبۆرینا خودێ ب دەست خوەڤە بینت.

## دان و ستاندن:

١- ژیانا ئەییووب پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بەری نەخوەشی و بەلا بێتە سەری، یا چاوا بوو؟

٢- ئەو چ نەخوەشی و بەلابوون هاتینە سەرێ پێغەمبەرێ خودێ ئەییووبی (سلاڤ لێ بن) ؟

٣- شەیتان ب چ ڕێكێ ل بەر گەڕییا ئەییووب پێغەمبەری د سەردا ببەت، و چاوا ئەییووبی بەرسڤا وی دا؟

٤- پێغەمبەرێ خودێ ئەییووبی (سلاڤ لێ بن) ل سەر بێنفرەهییێ خەلاتێ خودێ ب دەست خوە ڤە ئینا. ئەرێ ژیانا وی، پشتی هنگێ چ لێ هات؟

## بزاڤ و چالاكی:

ڤان هەردو ئایەتان ژ سۆرەتا (الانبیاء) ژ بەر بكە:

﴿ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِن ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَابِدِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾ (الأنبياء: ٨٣، ٨٤).

### وانەیا دەهێ:

## ڕۆژی و هندەک حوکمێن وێ

خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٨٣) أَيَّامًا مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (١٨٤) شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٨٥) وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ (١٨٦) أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ عَلِمَ اللهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ تِلْكَ حُدُودُ اللهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ (١٨٧) ﴾ (البقرة: ١٨٣–١٨٧).

### پێناسە:

**ڕۆژی** : ئەوە مرۆڤ خوە ژ خوارن و ڤەخوارن و ئاخڤتنا خراب و چوونا نڤینێ بدەتە پاش. و ستوونا سەرەکی یا ڕۆژییێ –وەکی فقهزانان دبێژن– ئەوە مرۆڤ خوە ژ وان تشتان بدەتە پاش یێن ڕۆژی پێ دکەڤت، هەر ژ دەرکەڤتنا بەرسپێدەیا دورست، هەتا ئاڤابوونا ڕۆژێ.

### خێرا ڕۆژییێ:

گەلەک فەرمۆدە ل دۆر خێرا ڕۆژییێ هەنە، ژ وان:

ئەبوو هورەیرە (خودێ ژێ ڕازی بت)، دبێژت: پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)) (بوخاری ڤەگوهازتییە) .

ئانکو: کەسێ ڕەمەزانێ ب باوەری بگرت و بۆ خوە ب خێر بهژمێرت، گونەهێن وی یێن بۆرین هەمی دێ بۆ ئێنە ژێبرن، و هەچیێ ل شەڤا ب قەدر ب باوەری ڕابت و بۆ خوە ب خێر بهژمێرت، گونەهێن وی یێن بۆرین هەمی دێ بۆ ئێنە ژێبرن.

## ڕەنگێن ڕۆژییان:

چەند ڕەنگێن ڕۆژییێ هەنە، ژ وان:

١- ڕۆژییێن فەر: گرتنا ڕۆژییێن هەیڤا ڕەمەزانێ.

٢- ڕۆژییێن نەفەر، و ئەو ژی ئەڤەنە:

أ- گرتنا ڕۆژییا ڕۆژا عاشوورایێ.

ب- گرتنا ڕۆژییا ڕۆژا عەرەفاتێ.

ج- گرتنا ڕۆژییا ڕۆژا دوشەنب و پێنجشەنبێ، ژ هەر هەفتییەکێ.

د- گرتنا سێ ڕۆژان ژ نیڤا هەر هەیڤەکێ، کو دبێژنێ ڕۆژێن سپی.

هـ- گرتنا شەش ڕۆژان ژ شەوالێ.

و- گرتنا هەیڤا شەعبانێ.

ز- گرتنا هەیڤا موحەڕەمێ.

ح- گرتنا هەیڤا ڕەجەبێ.

ت- گرتنا ڕۆژییا سوننەتا پیرۆز پێ هاتی، و خێر بۆ هاتییە دان.

و ڕۆژیگرتنا ڕەمەزانێ فەر دبت: ئەگەر هەیڤا ئێکشەڤی هاتە دیتن، دەمێ ئەسمان یێ ساهی بت، یان هەیڤا شەعبانێ بێتە تەمامکرن سیهـ ڕۆژ، ئەگەر ئەسمان یێ شێلی یان عەور بوو، ژ بەر گۆتنا خودایێ مەزن: ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾، و گۆتنا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن): ((صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُمِّيَ عَلَيْكُمُ الشَّهْرُ فَعُدُّوا ثَلاثِينَ)) (موسلم ڤەگوهازتییە) ئانکو: ب دیتنا هەیڤێ ڕۆژییێ بگرن، و ب دیتنا وێ بخون، و ئەگەر هەیڤ ل بەر هەوە بەرزەبوو، شەعبانێ بکەنە سیهـ ڕۆژ.

## دان وستاندن:

١- ڕۆژییێ پێناسە بکە؟

٢- ڕۆژییا نەفەر چەند ڕەنگەکن، هەمییان بهژمێرە؟

## وانەیا یازدەیێ:

# مەرجێن فەربوونا ڕۆژیگرتنێ

مەرجێن فەربوونا ڕۆژیگرتنێ، ئەڤەنە:

أ- ئیسلام.

ب- ئەقل، ڕۆژیگرتن ل سەر مرۆڤێ دین نینە، و گاڤا ئەو هشیاربوو و ب سەر خوەڤە هات، دڤێت ڕۆژیا ژێ چۆیی بگرت.

ج- بالقبوون، کو تەکلیف پێڤە گرێداییە، چونکی مەبەست ژ تەکلیفێ گوهدارییە، و ب زانین و شیانێ دبت، و ساڤاتی و زاڕۆکینییێ شیان تێدا نینە.

## سوننەتێن ڕۆژییێ:

سوننەتێن ڕۆژییێ گەلەکن، یێن گرنگ ئەڤەنە:

أ- خوارنا پاشیڤێ، ئەنەس دبێژت: پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً)) (بوخاری ڤەگوهازتییە). ئانکو: پاشیڤێ بخون، بەرەکەت د پاشیڤ خوارنێدایە.

ب- پاشئێخستنا پاشیڤێ یان درەنگ خوارنا وێ، و لەزکرن ل فتارێ.

ج- باشترە فتارە ب چەند لبێن ڕتەبان یان خورمەیێ بێتە کرن، ئەگەر ئەو نەبن ب چەند لبەکێن قەسپان یان ب ئاڤێ.

د- و باشترە ڕۆژیگر دەمێ فتارەکرنێ دوعایان بکەت. ژ عەبدللایێ کوڕێ عەمری - خودێ ژێ ڕازی بت - هاتییە ڤەگوهازتن، کو پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((ثَلاثَةٌ لا تُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ.. وَالصَّائِمُ حَتَّى يُفْطِرَ..)) (ئبن ماجەیی ڤەگوهازتییە). ئانکو: سێ مرۆڤان دوعایا وان نائێتە زڤراندن.. و ڕۆژیگر هەتا فتارێ دکەت.

د فەرمۆدەیەکێدا کو ژ ئبن عومەری -خودێ ژێ ڕازی بت- هاتییە ڤەگوهازتن، دبێژت: پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دەمێ فتارە دکر دگۆت: ((ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ وَثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللهُ)). (ئەبوو داوودی ڤەگوهازتییە). ئانکو: تێن چوو و هناڤ تەڕبوون و خەلات هاتە نڤیسین، ئەگەر خودێ حەز بکەت.

هەیڤا ڕەمەزانێ هندەک ساخلەت و باشیێن دی ژی هەنە، وەکی: نڤێژا تەراویحان، زێدەکرنا خێر و سەدەقەیان، مانا د مزگەفتێدا، و هندەکێن دی.

## تشتێن ڕۆژی پێ دکەڤت:

ڕۆژی هنگی دکەڤت دەمێ مەرجەک ژ مەرجێن وێ نەمینن، یان ستوونەکا وێ بشکێت، وەکی: دەرکەڤتنا ژ دینی، بێ نڤێژبوونا ژنێ و بچووک بوون، هەر خوارن و ڤەخوارنەکا ڕۆژی پێ بشکێت، و هەر تشتەکێ ژ دەرڤەیی لەشی، بچتە د زکێ ڕۆژیگریدا.

## دان وستاندن:

١- مەرجێن فەربوونا ڕۆژییێ چنە؟

٢- ڕۆژی ب چ دکەڤت؟ بهژمێرە؟



وانەیا دوازدەیێ:

# خوەپاررزتن ژ مەترسییا مینان

مامۆستایا زمانێ عەرەبی هاتە د پۆلێ ڤە، و وێ پێشتر قوتابی تەکلیف کربوون ب نڤیسینا دارشتنەکێ ل سەر مینان و زیانێن وان، و هەلویستێ ئیسلامێ ل سەر ڤێ دۆزێ. وێ داخواز ژ سروایێ کر، کو تشتێ وێ نڤیسی بخوونت، ئینا سروا رابوو و ئەڤە بۆ هەڤالێن خوە خواند:

((ل بن سیبەرا گوهۆرینێن دەولەتی و وان مەترسییێن تووشی مرۆڤانییێ دبن، دۆزا مینێن ئەردی، بوو ئێک ژ گرنگترین و ئالۆزترین بابەت د ژینگەها مرۆڤانییێدا، نەمازە پشتی کۆما زیانێن ژێ پەیدابوویین، کو ب مەلیۆنان هاتینە تەخمین کرن، و زیانێن ئابۆری، گەهشتنە ملیاران. ئەڤە بوو دەنگەکێ جیهانی یێ گشتی دژی چاندنا مینان پەیداکری، و گەلەک کریارێن نێڤ دەولەتی، ژ بۆ هشیارکرنا خەلکی و دیارکرنا مەترسییێن مینان و هاندانا جیهانێ بۆ قەدەغەکرنا کارئینانا وان، پێشچاڤ کرین.



و هەلویستێ ئیسلامێ ژ ڤێ دۆزێ ئاشکەرایە. د ئیسلامێدا نە تشتەکێ رەوایە شەر د گەل خەلکێ سڤیل (مەدەنی) و شەرنەکەر بێتەکرن، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((لا ضرر ولا ضرار)) و دئێتە ڤەگوهازتن، کو عومەرێ کورێ خەتتابی (خودێ ژێ رازی بت) د رێکا خوەرا، دەمێ ژ شامێ دزڤری، د بەر هندەکانرا بۆری، ل بەر تاڤێ هاتینە راوەستاندن، و زەیت ب سەرێ واندا دئێتە کرن، ئینا پسیارکر: ئەڤان خێرە؟ گۆتنێ: ئەڤان زێرەسەر (جزیە) کەڤتییە سەر و نەداییە. ئینا عومەر (خودێ ژێ رازی بت) گۆت: بهێلن و ژڤان ڤەبن و بارەکێ ژ تاقەتا وان مەزنتر نەهاڤێنە سەر ملێن وان، من ژ پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) بهیستییە، دبێژت: ((لا تعذبوا الناس، فان الذین یعذبون الناس فی الدنیا، یعذبهم الله یوم القیامة)).

ئانکو: خەلکی ئیزا نەدەن، ئەڤێن خەلکی د دنیایێدا ئیزا ددەن، خودێ دێ وان ڕۆژا قیامەتێ ئیزا دەت. ئینا فەرمان دا، کو دەست ژ وان بەردەن و ئازاد بکەن)).
مامۆستایێ گۆت: دەستخوەش و ئافەرین، کی دێ تشتەکێ دی، ل سەر بابەتی زێدەکەت؟
سۆزانێ گۆت:
من سێ تەوەر ل دۆر بابەتی هلبژارتینە، ئەو ژی ئەڤەنە:




## هشیارکرن و ئاگەهدارکرنا خەلکی ل سەر مەترسییا مینان

پێتڤییە مرۆڤێ موسلمان، خوە ژ جهێن ب ترس دوور بێخت و بەرێ خەلکی ژی بدەتە هندێ. دڤێت مرۆڤێ موسلمان دلۆڤانییێ ب خوە و ب خەلکی ژی ببەت، پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((لا یرحم الله من عباده، إلا الرحماء)). ئانکو: خودێ دلۆڤانییێ ب وان بەندەیان دبەت، ئەوێن د ڕاستا غەیری خوەدا دلۆڤان. ڤێجا دەمێ مرۆڤێ موسلمان دلۆڤانییێ ب برایێ خوە یێ موسلمان دبت، بەرێ وی ددەتە خێرێ و ڕاستەڕێ دکەت، دا تووشی زیانێ نەبت.







## هشیارکرن و ئاگەهدارکرنا ڕێڤینگان:

چونکی ڕێبار و ڕێڤینگ، قەستا مزگەفتان ل گوندان دکەن، پێتڤییە زانایێن ئایینی، بەری هەر کەسەکی، وان ڕاستەڕێ بکەن، چونکی دبت ئەو ل دەڤەرێ شارەزا نەبن و وان جهان نەنیاسن، ئەوێن مین لێ هاتینە چاندن، و ب ڤێ چەندێ، ئەو ل دەڤ خودایێ مەزن خودان خێرن، هەر وەکی پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((من دعا الی هدی کان لە من الأجر مثل اجر من اتبعە، لا ینقص ذلک من اجورهم شیء)) (ئەبوو هورەیرەی ڤەگوهازتییە). ئانکو: هەچیێ بەرێ ئێکێ بدەتە خێرەکێ، کا چەند خێر دگەهتە خێرکەری، هند دگەهتە وی ژی، ئەوێ بەرێ وی ددەتێ، بێ کو تشتەک ژ خێرا وان ژی کێم ببت.

## گوهۆڕینا ڕەفتارێ خرابکار و بەدکاران:

مرۆڤێن بەدکار، مرۆڤ دشێت ڕەفتارێ وان ل دووڤ شەریعەتێ ئیسلامێ ڕاست بکەت، ژ بەر هندێ دەرگەهێ تۆبەیێ هەردەم ڤەکرییە، و تۆبە بەلگە و نیشانە ل سەر گوهۆڕین و هێلانا گونەهان، هەر وەکی پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( ... واتبع السیئة الحسنة تمحها، وخالق الناس بخلق حسن)).

ئانکو: شوونا خرابییێ باشییێ بکە، ئەو باشی دێ سەری ژ خرابییێ ستینت و پووچ کەت و ناهێلت، و ب باشی ڕەفتاری د گەل خەلکی بکە.

ژ بەر ڤێ چەندێ، ئەگەر مە کەسەک دیت، کو سەرەدەرییێ د گەل چەکی و تەقەمەنییان دکەت، و دچتە د دەڤەرێن مینرێژدا، فەرە ل سەر مە، ئەم وی ڕاستەڕێ بکەین و شیرەت بکەین و بەرێ وی ژ ڤی ڕەفتارێ ب زیان، بۆ وی و بۆ غەیری وی، وەرگێڕین)).

مامۆستایێ سوپاسیا هەردو قوتابییان کر، ل سەر جهێنانا ڤی ئەرکی، و گۆت:

هندەک تشتێن دی ژی، د ڤی واریدا هەنە، دڤێت مە ئاگەهـ ژێ هەبت، چونکی ئەرکێ دینی و ئیسلامی، ل سەر مە فەر دکەت، ئەم ئەرکێ خوە د ڕاستا ڤان تشتاندا ب جهـ بینین:

١- کارنەئینانا چەکی ل جهێن گشتی.

٢- خوەدوورخستن ژ جهێن مینرێژکری و ژ شوونماییێن لەشکەرگەهان.

٣- پارزتنا نیشانێن ئاگەهدارکرنا جهێن مینرێژکری و تەقەمەنییان.

٤- هاریکاریکرنا تیپێن ڕاکرن و نەهێلانا مینان.

٥- کارنەئینانا تەقەمەنییان بۆ نێچیرا ماسییان، و کارئینانا تۆڕ و چەنگالان.

مامۆستایێ ل دووماهییا وانەیێ، داخواز ژ قوتابییان کر، کو هەر ئێک، دارشتنەکێ بنڤیست ل سەر ئێک ژ ڤان بابەتێن وێ بەحسکرین.

## بزاڤ و چالاکی:

قوتابی، د وارێ بەرهەڤکرنا بەلاڤۆک و پۆستەرێن هشیارکرنێدا ل دۆر مەترسییا مینان، دێ هاریکارییا مامۆستایی کەن، و دێ وەک نواندن، ب دیمەنێن چاوانییا سەرەدەرییێ رابن، دەمێ دکەڤنە د ناڤ جهێن مینرێژکریدا، کا دێ چ کەن؟ ژ بۆ ڤێ مەرەمێ، هندەک قوتابی، دێ ب ئەنجامدانا ڤی کاری، ئێنە تەکلیفکرن.

## وانەیا سێزدەیێ:

# حەرامكرنا بەرتیلێ

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((لَعَنَ اللهُ الرَّاشِيَ وَالمُرْتَشِيَ وَالرَّائِشَ الَّذِي يَمْشِي بَيْنَهُمَا)) (حاكمی ڤەگوهازتییە).

| پەیڤ | رامانا وێ |
| --- | --- |
| لعن | خودێ ژ دلۆڤانییا خوە دوورئێخست. |
| الراشی | بەرتیلدەهـ؛ كەسێ بەرتیلێ ددەت. |
| المرتشی | بەرتیلخوەر؛ بەرتیلوەرگر. |
| الرائش | كەسێ ناڤنجیاتیێ د ناڤبەرا بەرتیلدەهـ و بەرتیلخوەریدا دكەت. |

## پێناسەیا بەرتیلێ:

ئەو مال و متایە، ئەوێ مرۆڤ ژ بۆ دەستڤەئینان و وەرگرتنا مافەكی ددەت، كو نەیێ وی بت، یان بۆ وەرگرتنا پایە و كارەكی ددەت، كو نە هێژایی وی بت.

## حەرامكرنا بەرتیلێ:

ب ترسترین و پیسترین جوونێ گەندەلییێیە، ئەو وەكی پەنجەشێرا كوژەكە، ژ بەر هندێ هەمی دینان ئەو حەرامكرییە، و دینێ پیرۆزێ ئیسلامێ، بەرتیل د گەلەك ئایەتاندا حەرامكرییە، ژ وان: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالْإِثْمِ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ (البقرة: ١٨٨). و فەرمۆدەیێن پێغەمبەری ل دۆر حەرامكرنا بەرتیلێ گەلەكن، ژ وان ئەڤ فەرمۆدەیا پیرۆزە، ئەوا دیار دكەت، كو كەسێ بەرتیلێ بخوت یان بدەت، یان ناڤنجیاتیێ بۆ بكەت، دێ ژ دلۆڤانییا خودێ ئێتە دوورئێخستن.



## ئەگەرێن حەرامکرن و قەدەغەکرنا بەرتیلێ:

١- تشتەک پێ ب دەستڤە دئێت، نە مافێ مرۆڤییە، وەکی خوەڤەدزین ژ دانا باجێ، یان بۆ خوە ئێخستنا بازارەکا گشتییا داخواز بۆ هاتییە کرن، یان گرێدانا گرێبەستەکا نەقانوونی.

٢- مافێ ئێکێ دی، پێ دئێتە خوارن، وەکی فەرمانبەرییەکێ کو غەیری وی ژێ بێتە دوورئێخستن.

٣- کەسێ بەرتیلێ ددەت، پێ دگەهتە پایەیەکا گرنگ. حەرامی دژوارتر لێ دئێت، دەمێ بەرتیلدەهـ نە هێژایی وێ پایەیێ بت.

## چارەسەرکرنا بەرتیلدانێ:

أ- جهئینانا بنەمایێ دادپەروەرییێ د ناڤبەرا هەمی کورێن ملەتیدا.

ب- دانانا مرۆڤێ گونجایی ل جهێ گونجایی.

ج- جهئینانا قانوونێ ل سەر وان فەرمانبەر و بەرپرسان، ئەوێن بەرتیلان ب رێکا پایەیێن خوە یێن کارگێری و سیاسی دخون.

## دان و ستاندن:

١- بەرتیلێ پێناسە بکە.

٢- بۆ چ پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) مە ژ بەرتیلێ ددەتە پاش؟

٣- ئەگەرێن حەرامکرنا بەرتیلێ چنە؟

٤- ئایەتەکا قورئانێ، ل سەر حەرامکرنا بەرتیلێ، بینە.

٥- جوون و رەنگێن بەرتیلێ بهژمێرە.

٦- چاوا دیاردەیا بەرتیلێ د جڤاکێدا دێ چارەسەرکەین؟

وانەیا چاردەیێ:

# هزرکرن د چێکرییێن خودێدا

عەقل ژێدەرێ هزرکرن و ئالاڤ و ڕێکا زانینێیە و ئەو مەزنترین کەرەمە خودێ د گەل مرۆڤی کری. گەوهەرێ ڕاستی و ئەرکان پێ دئێتە ناسکرن. جوانییا گەردوونی و زڤڕینا وی پێ دئێتە دیارکرن. خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴾ (آل عمران:١٩١)

ئانکو: مرۆڤێن باوەردار هزرێن خوە، د چێکرییێن خودێدا دکەن، و بۆ ڤی کاری، عەقل و چاڤ و هەستێن خوە، ب کار دئینن. ب عەقلێ خوە، مەزناتییا چێکەری، د چێکرییاندا دبینن، و دزانن کو ئەڤە چێکرییێن چێکەرەکێ زێدە شارەزانە.



و ئەو ب چاڤێن خوە، جوانییا چێکرییێن خودێ د هەمی تشتاندا دبینن، ڤێجا بۆ ڤێ جوانییێ، دا ژ مرۆڤی دەست پێ بکەین، کو پیرۆزترین و ب قەدرترین چێکرییە، و دا ئەم دووڤچوون و ڤەکۆلینا خوە د چاڤیدا بکەین.

هەر ئێک ژ مە، مەندەهۆشیيا خوە دیار دکەت، بەرانبەری جوانییا چاڤان و هوورکارییا کاریێ پێ ڕادبن. چاڤ هەمی ڕەنگان ژێک جودا دکەت، و نێزیک و دووران، هەما هۆ دبینت، و کاریێ وی د کێشانا وێنەیاندا، وەکی کاریێ وێنەگرییە، بەلێ پیچەکێ ژێ جودایە، ژ بەر کو چاڤ بێ کو هەوجەیی ئالاڤێ نێزیککرن و دوورخستنێ ببت، کاریێ خوە دکەت.

ژ نیشانێن جوانی و مەندەهۆشییێ د چێکرییێن خودێدا، ئەوە ئەوا زانینێ دیارکری، کو ل سەر ڕوویێ ئەردی تو دو مرۆڤان نابینی، شوونتبلا وان یا بەرانی وەکی ئێک بت.

مەندەهۆشی د جوانی و خەملا وی بەرهەم و فێقیدا یێ دلێ مرۆڤی دچتێ و مفایێ وان بۆ چێکرییان، خودێ دبێژت: ﴿وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُتَرَاكِبًا وَمِنَ النَّخْلِ مِنْ طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انْظُرُوا إِلَى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنعام: ٩٩).

مەندەهۆشی د گەلەک تاما فێقی و بەرێ داروباراندا هەیە. هەنە شرین وەکی تری و خورمەیێ و هندەکێن دی، و هەنە ترش، وەکی لەیموونێ و سماقێ، و هەنە شرین و ترش، وەکی پرتەقالێ و خۆخێ و هناریێ. فێقی گەلەکن و گەلەک جوون و ڕەنگ ژێ هەنە. قورئانا پیرۆز ئیشارەتێ بۆ ڤێ چەندێ دکەت و دبێژت: ((وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ)) (إبراهيم: ٣٤).

هندەک ژ ڤان بەرهەمان، تێر زەیت و ڕوونن و گەلەک ب مفانە بۆ ساخلەمییا مرۆڤی، وەکی زەیتوونێ و گوێزێ و فستەقێ.

خودایێ مەزن ئەڤ بەر و بەرهەم و فێقییە گەلەک ڕەنگ داینە، دا مفایێ وان یێ خوارنێ، د گەل ساخلەمییا مرۆڤی بگونجت، و سیستەمێ ساخلەمییا مرۆڤی، پێ بێتە پارزتن و چو ئێش ل مە پەیدا نەبن.

خودایێ مەزن ژ شارەزاییا خوە، هندەک فێقی چێکرینە، زڤستانان، گەلەک گەرمێ ددەنە لەشێ مرۆڤی، وەکی گوێزێ و زەیتوونێ، و هندەک ژی بۆ هاڤینێ چێکرینە، ب سروشتێ خوە تەزییاتییێ ددەنە لەشێ مرۆڤی، وەکی گندۆر و زەبەش و خیاری.

ژ بەر هندێ یا دورست ئەوە ئەم بێژن: هەر گیا و شینکاتییەکی ل سەر ڕوویێ ئەردی، وەکی کارخانەیەکێیە بۆ بەرهەمئینانا فێقی و ئەو فێقی تامەکا شرین یان یا مز یان یا تەحل ددەتە مرۆڤی. مەندەهۆشی هێژ زێدەتر لێ دئێت، دەمێ تو دبینی، پاییزێ بەلگێن دارەکێ دوەرن، لێ بەلگێن دارەکا دی، ب تاک و چەقانڤە دمینن و بەردەوام وەرارێ دکەن، وەکی یێن دارا زەیتوونێ و هنگی دنیایێ. هندی دارا هنگی دنیایە، زڤستانێ کولیلکان ددەت، و خوە ل بەر سوڕ و قڕا زڤستانێ یا دژوار دگرت، هەتا لێ دبتە بهار.

و د جیهانا باڵندەیاندا، ژ وێ جوانییا بالکێش، ژ وان پەڕێن جوان و نەخشین و نەرم، و ژ وان ڕەنگێن دلکێش، و وێ ژین و ژیارا وان یا غەریب د وارێ خوارن و زێدەبوونێدا، مرۆڤ مەندەهۆش دبت. هەچیێ بڤێت ژ ڤێ چەندێ پشتڕاست ببت، بلا بەرێ خوە بدەتێ، هەر جوونەک ژ جوونێن باڵندەیان، سیستەمەکێ خوارنێ و ژینگەە و ژیارا خوە یا تایبەت هەیە، و ژێ دەرناکەڤت. مشەختبوونا باڵندەیان ئێک ژ وان دیاردەیێن بالکێشە. دێ بینی هندەک باڵندە ژ جهەکی مشەخت دبنە جهەکێ دی، دا ژینگەهەکا گونجایی بۆ خوە ببینن و لێ بژین... ئەرێ: کێ نیشا وان داییە کو وارەکێ نەگونجایی بۆ ژیانێ، ب ئێکێ گونجایی بگوهۆڕت؟ و کێ ئەو ب سەر ڤی جە و وارێ گونجایی و دوور هلکرییە، یێ وی بەری هنگی نەدیتی؟!

و د جیهانا مێشەمۆراندا، مرۆڤ ژ کارێ مێشا هنگڤینی مەندەهۆش دبت، دەمێ شانەیێ ل دووڤ پیڤەرەکێ ئەندازەیی یێ هوور چێ دکەت، و مرۆڤ ژ ژیانا وێ یا جڤاکی و بزاڤ و بەرگەڕیانا وێ یا بەردەوام، ژ بۆ خوارنێ مەندەهۆش دبت.

هەر وەسا مرۆڤ ژ جوانییا چیایێن هلدایی و سەرئەڤراز هلکشیایی و بلند، و یا گرک و بەتەن و سوولاڤ و کانیکێن ئاڤێ، مەندەهۆش دبت.

و د جیهانا دەریایاندا، مرۆڤ ب چاڤێن خوە، بەرێ خوە ددەتە چێکرییێن خودێ ئەوێن زێدە و زاڤ و گەلەک و مشە، هەر چێکرییەکی، ڕەفتارەکێ ڤەبڕی و دەستنیشانکری د خوارن و زێدەبوون و ژینگەها خوەدا هەیە، کو ل دووڤ سروشتەکێ دچت، د لەشێ وان چێکرییاندا چاندییە. ژ بلی هندێ ژی، ئەو دەریا تژی لۆلۆ و مەرجانن، کو ئەو ژی ژ گەوهەرێن گرانبهانە.

و پشتی هش و ئەقل و بیناهی، بەرانبەری چێکرییێن خودێ، کارێ هزرکرنێ ئەنجام ددەن، هەست ژی ژ بەرێ خوەڤە، پشکدارییا وان دکەت و بەرانبەری جوانییا چێکرییێن خودێ و هوورکارییا چێکرنا وان، ئەو ژی دگوهشت و مەندەهۆش دمینت.



مرۆڤ هەست ب ڤی جوانییێ دکەت و تێکل دبت و حەز ژێ دکەت، و بەلگە و نیشان ل سەر ڤی هەستی ئەڤەنە:

١- کارلێکرنا کوور ب جوانییا ستێرێن گەش و روهن و هەیڤا چاردەشەڤی یا ڕوهن.

٢- ڤیانا زێدە بۆ سروشتی ب نهال و سوولاڤ و داروبار و گول و گیایانڤە.

ب ڤان وێنەیێن ژێگۆتی، مەزناتییا خودایێ مەزن د چێکرییێن ویدا دیاردبت. خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴾ (النمل: ٨٨).

قوتابیێ هێژا، پێدڤییە تو هندەک عیبرەتان بۆ خوە ژ ڤان چێکرییان وەرگری، عەقلێ تە و چاڤێ تە و هەستا تە، تە پال ددەن کو تو هزرا خوە بکەی، و ئەڤە دێ بەرێ تە دەتە ناسینا خودێ. ئەڤ چێکرییە، هۆسا ژ قەستا و بێ مەرەم نەهاتینە سەر دنیایێ، بەلکو چێکەرەکی ئەو دایینە، ئەها ئەوە خودانێ ڤێ هەمی هەبوون و جوانییێ.

## نموونەیەک ژ چێکرییێن خودێ یێن عەجێب:

سەردار قوتابی بوو و مالا وی ل گوندی بوو، بابێ وی گۆتێ: من هندەک مێری نێزیکی ڕێکێ دیتن. هەردو پێکڤە ل سەر مێرییێ کەڤتنە دان و ستاندنێ:

سەرداری گۆت: باب تە چ ژ مێرییان دیتییە؟

بابێ وی گۆت: کورێ من، مێرییێ ژین و ژیارەکا ئەنتیکە د گەل کاری هەیە. ئەو ژ کونا خوە دەردکەڤت و بەردەوام و بێ ڕاوەستان، ل دووڤ قووتێ خوە دگەڕیێت و دئینتە مالا خوە. ئەگەر عمبارکر، و دانێ ئەو پێ بحەست کو دێ شین بت، دکەتە دو کەر دا شین نەبت، و ئەگەر تەڕ بوو و ترسیا بڕزت و کیفۆیی ببت، دێ خوە ل ڕۆژەکا تاڤ گرت، دا بدانتە بەر تاڤێ، و چو مێری ژ وی قووتێ ناخون، ئەوێ غەیری وێ کۆم کری.

سەرداری گۆت: باب، کارێ مێرییێ ئەڤێ هە، من گەلەک مەندەهۆش دکەت.

بابێ وی گۆت: بەلێ کورێ من، چێکرییێن خودێ گەلەکن، و کارێن وان بۆ وی کەسێ ب عەقل بەرێ خوە بدەتێ و هزرا خوە تێدا بکەت، دعەجێبن.



## پسیار:

١- ئایەتەکێ بینە، کو ببتە بەلگە و نیشان ل سەر هزرکرنێ د چێکرییێن خودێدا.

٢- ئایەتەکێ بنڤیسە، جوانییا چێکرییێن خودێ د فێقیدا دیار بکەت.

٣- ئایەتەکا تە ژ بەر بت بنڤیسە، کو ببتە بەلگە و نیشان ل سەر هندێ، کو چێکرییێن خودێ د چێکرنا خوەدا زێدە بنەجهن.

٤- بەلگە و نیشان ل سەر هەست و زانینا مرۆڤی بۆ جوانییێ، چیە؟

نیشانا (دورست) ل بەر دەستەواژەیا ڕاست و یا (خەلەت) ل بەر دەستەواژەیا خەلەت دانە:

١- چاڤ نێزیک و دوورا هۆسا دبینت.

٢- نەخشەیێ سەرتبلێن هەمی کەسان وەکی ئێکن.

٣- باللندە ژ جهەکی مشەخت دبنە جهەکێ دی، ژ بەر ئەو نزانن ژینگەهەکێ گونجایی بۆ خوە دابین بکەن.

**ڤان ڤالاهییان ب پەیڤا گونجایی ئەوا د ناڤبەرا دو کڤاناندا تژی بکە:**

١- مێشا هنگڤینی شانەیێن خوە ........... چێ دکەت. (ب خیالەکا گۆترە - ب پیڤانەکا ئەندازەیی)

٢- فێقی گەلەک ڕەنگن، دا هەمی تام بۆ مرۆڤی ............ (بەردەست ببن - هەڤسەنگ ببن)

٣- مەرجانێ گرانبها، مرۆڤ ژ ............... پەیدا دکەت. (کارخانەیێن هەڤچەرخ - بنێ دەریایان).

## هندەک زانینێن گرنگ:

١- ستێر دلڤن و لڤینا وان ژ ستێرەکێ بۆ ئێکێ جودایە.

٢- هەر پارچەیەک ژ زمانێ مرۆڤی هاتییە تەرخانکرن، بۆ تامکرنا تشتەکی شرین یان مز یان تەحل.

٣- جیهانا باللندەیان، جیهانەکا زێندییە وەکی یا مە مرۆڤان، و بەلگە و نیشان ل سەر گۆتنا پەپۆکێیە بۆ سلێمان پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) هەر وەکی د قورئانا پیرۆزدا هاتی: ﴿ أَحَطْتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِنْ سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴾ (النمل: ٢٢).

## چەند هزرکرنەک:

١- من هزرێن خوە د وێ دارگویزێدا کرن، ئەوا ژییێ وێ ژ سەد سالان بۆری و من گۆت: ئەرێ تو بێژی ڤێ دارگویزێ ب درێژاهییا ژییێ خوە، چەند تەن ژ زەیتێ و شەکرێ داپینە؟

٢- من هزرا خوە د عەقل و بیرتیژییا مێشا هنگڤینی دا کر، ئەوا دزڤرتە مالا خوە و دزڤرت و دشێت ب دورستی و ل دووڤ گەڕێن زڤرینا خوە، دووراتییێ دەستنیشان بکەت، پاشی بزڤرتە شانەیا خوە.

٣- من هزرێن خوە د ئاوایێ نێچیرکرنا وی شینکاتیدا کر ئەوێ مێشەمۆران دگرت، دەمێ ئەو مێشەکێ دگرت، چاوا ئەو بەلگێن خوە لێ دئینتە ئێک و دگڤێشت و دخوت.

## بزاڤ و چالاکی:

١- دەمێ ئەز ڤێ ئایەتا پیرۆز دخوونم: ﴿ مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ۝١٩ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ ۝٢٠ ﴾ (الرحمن: ١٩ و ٢٠)، ئەوا زانایێ فرەنسی (جاک کۆستۆ) ل دووڤ ئیشارەتا وێ دیار کری، کو دو دەریایێن نەوەکهەڤ ئاڤا وان تێکلی ئێک نابت، ئەز هنگێ باش دزانم کو خودێ د کار و کریارێن خوەدا زێدە شارەزایە.

٢- دەمێ ئەز چووچکەکێ دبینم خوارنێ کۆم دکەت و ب نکلی ددەتە تێشکێن خوە، ئەز دزانم کو خودایێ مە د ڕاستا چێکرییێن خوەدا زێدە دلۆڤانە.

٣- دەمێ ڕۆژ ئاڤا دبت و دبتە شەڤ، و خەلک دنڤن، دا پشتی وەستیانێ رحەت ببن، و پاشێ ڕۆژ سپێدێ دهلێت و دبتە ڕۆژ، و خەلک سەر ژ نوو، دەردکەڤنە سەر کارێ خوە، ئەز هنگێ دزانم، کو خودێ د ڕێکخستنا ژین و ژیارا واندا زێدە شارەزا و زانایە.



## وانەیا پازدەیێ:

# پێکئینان د ناڤبەرا خەلکیدا



## مرۆڤ و ئاشتی:

مرۆڤ ب سروشتێ خوە یێ مەدەنییە، یێ هاتییە ئافراندن دا کەسەکێ جڤاکی بت، نە کو ڤەدەر و کووڤی بژیت، و خودێ حەزکرییە کو پەیوەندی د ناڤبەرا مرۆڤاندا زەلال بن، نە شێلی، بەلێ دبت ئەڤ پەیوەندییە هندەک جاران شێلی و لاواز ببن، و جودابوون و هەڤڕکی پاشی نەیارەتی پەیدا ببت. بەلێ دیسا پێکئینان و ڤەمراندنا ئاگرێ دوژمناتییێ، و بێ دەنگکرنا کەربێ، تشتەکێ د شیاندایە و یێ ساناهییە ئەگەر مرۆڤ نەکەفتە ڕکێ، ژ بەر کو مرۆڤ ژ هندێ مەزنترە، و گەلەک جاران مە دیتییە جودابوون و هەڤڕکی و نەیارەتی و شەڕ پەیدابووینە پاشی ئاگرێ وان هاتییە ڤەمراندن، و ل شوونێ ئاشتی و ڤیانێ جهگرتییە.

و ئەگەر ئەم بەرێ خۆ بدەینە قورئانا پیرۆز دێ بینین وێ فەرمان ب چاککرن و پێکئینانێ کرییە، وەکی د ڤێ ئایەتێدا هاتی: ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ (الحجرات: ١٠) .

ئانکو: باوەردار برایێن ئێکدونە، ڤێجا هوون برایێن خوە پێک بینن، و ژ خودێ بترسن دا رەحم ب هەوە بێتەبرن. و قورئان ب باشی بەحسێ وان کەسان دکەت یێن خەلکی پێک دئینن، و دبێژت: ﴿ لَا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِنْ نَجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ (النساء: ١١٤).

ئانكو: چو خێر د گۆتنا واندا نینە دەمێ ئەو ڤەشارتی د گەل ئێكدو دئاخڤن، ئەو تێ نەبت یێ فەرمانێ ب دانا خێران دكەت، یان مرۆڤان پێك دئینت، و هەچییێ بۆ رازیبوونا خودێ ڤێ چەندێ بكەت، ئەم دێ خێرەكا مەزن دەینێ.

## ئەگەرێن هەڤڕكی و لێككەفتنێ:

ئیسلام وان دەرگەهان ل بەر مرۆڤان دگرت یێن هەڤڕكی تێڕا دەرباس دبت، و ل ڤێرێ ئەم دێ هندەك ژ وان ئەگەران بێژین یێن هەڤڕكییێ پەیدا دكەن، و دڤێت ئەم خوە ژێ بدەینە پاش:

١- **ژێكجودابوون (ئختیلاف)** : ئیسلام بەرێ موسلمانان ددەتە هندێ كو ئەو د گەل ئێكدو دنەرم بن، و ژ ڕكداری ژێك جودا نەبن، جارەكێ سەحابی د مەسەلا قەزا و قەدەرێدا ژێك جودا بوون، پێغەمبەرێ (سلاڤ لێ بن) گۆتە وان: ((**ما خودێ فەرمان ب ڤێ چەندێ ل هەوە كرییە؟ ئەرێ ما هوون ژ ڤێ چەندێ نەهاتیینە پاشڤەبرن؟ مللەتێن بەری هەوە ب ڤێ چووبوونە هیلاكێ**)) و چەند ژێكجودابوون كێمتر لێ بێت هەڤڕكی و سلبوون دێ كێمتر بت.

٢- **دلڕەشی**: دلڕەشی نەڤیانێ پەیدا دكەت، و خودانێ خوە دكەتە دوژمنێ مرۆڤان، و هندی ئەو یێ دلڕەش بت هەر دێ نەیارەتییێ كەت.

٣- **ململانا نەشەریف**: ئەو كەسێ ب ڕەنگەكێ نە یێ شەریف ململانێ د گەل خەلكی بكەت، ئەو دێ هەمی ڕێكێن خراب ب كارئینت دا كەسێ بەرانبەر بشكێنت، و خوە پێش بێخت، و ژ بەر كو كەسێ بەرانبەر ڤێ چەندێ قەبوول ناكەت، هەڤڕكی دێ پەیدا بت.

٤- **پێلێدانا مافێن خەلكی و ستاندنا مالێ وان**: و ئەوێ مالێ وی ژێ دئێتە ستاندن، و بەرژەوەندێن وی دئێنە پێلێدان رازی نابت، ڤێجا هەڤڕكی پەیدا دبت.

٥- **سەپاندنا بیر و رایان**: ئەو كەسێ بیر و رایێن خوە ب كوتەكی ل سەر خەلكی دسەپینت، ئەو چو بهایی نادەتە بیر و بۆ چوونێن مرۆڤان، و ئەڤە هەستا وان دشكێنت و دبتە ئەگەرا هەڤڕكییێ.

٦- **گەلەك ڕەخنەگرتنا نەئاڤاكەر**: ژ بەر كو ڕەخنەگرتن هەستا خەلكی بریندار دكەت، و وان دكەتە دوژمن بۆ مرۆڤی.

٧- **خوەدووركرن ژ هەڤڕكییێ**: چێ نابت مرۆڤ بهێلت هەڤڕكی درێژ و بەردەوام بت، بەلكی دڤێت ئەو زوو كاری بۆ نەهێلانا وێ بكەت، ژ بەر كو لایەكێ دی خوە بكەتە د ناڤ مەسەلێدا و ئاگرێ فتنێ د ناڤبەرا هەردو لایێن هەڤڕكدا خوەش بكەت.

پشتی ڤێ هەمیێ رۆلێ عەقلی دئێت دا کارێ خوە بکەت، و هندی مرۆڤ کاری ب رۆناهیا عەقلی و کاربنەجهییێ بکەت، بەرێ وی دێ کەفتە رێکا دورست، و بەرزە نابت. و ژ عەقل و کاربنەجهییێیە مرۆڤ هەر ژ سەری لەزێ بکەت دا هەڤرکییێ نەهێلت، و رکا تۆلڤەکرنێ نەگرت، ژ بەر کو ب سەربۆر هاتییە زانین کو ئەوێ ڤێ چەندێ بکەت دێ پەشێمان بت، بەلێ ل دەمەکی کو پەشێمانی چو مفایی نەدەت.

و پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) ئوممەتا خوە ل ڤی سالۆخەتی هشیار دکەت، دەمێ دبێژت: ((أَبْغَضُ الرِّجَالِ اْلأَلَدُّ الخَصِمِ)) ئانکو: نەخوەشتڤیترین زەلام ئەوە یێ خوار بت و گەلەک حەز ژ هەڤرکییێ بکەت. و ئەڤە هندێ دگەهینت کو دڤێت مرۆڤ توخووبەکی بۆ هەڤرکییێ بدانت.

و ژ عەقلدارییێیە مرۆڤ ل دەمێ شیانێ لێبۆرینێ ب کار بینت، و ئەوێ رکدارییێ دکەت دێ لۆمە لێ ئێنەکرن، و نە ژ عەقلدارییێیە مرۆڤ خوە مەزن بکەت، و ئەو کەسێ ل رێکا شەیتانی بچت و وەکی وی خوە مەزن بکەت، دێ شکێت و رەزیل بت، و یا باش بۆ مرۆڤی ئەوە داخوازا لێبۆرینێ ژ هەڤالێ خوە بکەت، و بەر ب ئاشتبوونێ ڤە بچت.

و دو رەنگێن پێکئینانێ هەنە:

## رەنگێ ئێکێ:

پێکئینانا خوە ب خوەیی، یان پێکئینانا ناڤخوەیی د گەل نەفسێ: و ئەڤە ئەوە تو د گەل خوە پێک بێی دەمێ تو چو خرابییێ نەگەهینییە مرۆڤان، و هنگی تو چو هەڤرکییێ ناکەی و تە پێتڤی ب هندێ نابت د گەل کەسێ پێک بێی، و ئەگەر تو د نەفسا خوە دا یێ چاک بووی، و تە خوە چاک کر، تو بۆ کەسێ نابییە هەڤرک، و ئەڤە ب هێزترین و ساناهیترین پێکئینانە.

## رەنگێ دویێ:

پێکئینانا نە خوە ب خوەیە، یان پێکئینانا دەرڤەیی: و ئەڤە د ناڤبەرا دو لایێن هەڤرکدا چێ دبت ژ لایەکێ سێیێ ڤە، وەکی دێ ئاشکەرا کەین:

أ- پێکئینانا دەرڤەیی د ناڤبەرا دو لایاندا، بێی کو لایەکێ سێیێ هەبت، ئەڤە دەمێ هەڤرکی یا دژوار نەبت. و ئەڤە ب چەند رێکەکان چێ دبت،ژ وان:

١- دڤێت لایەک داخوازا لێبۆرینێ ژ لایێ دی بکەت، و ئەوێ بەراهییێ لێبۆرینێ دخوازت ئەو چێترە، ڤێجا ئەگەر تو یێ عاقل بی لەزێ بکە دا تو سەرکەفتییێ ئێکێ بی ل ڤان دەمان.

٢- زڤراندنا مافی بۆ خودانی، چونکی ژێستاندنا مافان د ئیسلامێدا حەرامە.

ب- ئەو پێکئینانا ژ لایەکێ سێیێ ڤە چێ دبت دەمێ هەڤرکی یا دژوار، و ئەڤە ژی ب چەند رێکەکان چێ دبت، ژ وان:

١- دڤێت کەسەکێ کاربنەجهـ و رحەت هەبت، هەردو لایێن هـەڤرک پـێ رازی بـن، دا ب کارێ پێکئینانێ رابت.

٢- گوهداری بـۆ خـالێن هـەڤرکیا هـەردو لایـان بێتـەکرن، و خـالێن هەڤپشک بێنـە وەرگرتن دا هەردو لایێن هەڤرک پێ بێنە نێزیککرن.

٣- هەمی دەرگەهێن خرابیێ ل بەر هەڤرکییێ بێنە گرتن.

٤- هەر دەرگەهەکێ هەبت بەرانبەر ئاشتییێ بێتە ڤەکرن.

٥- ئەو گۆتنێن خێرێ بێنە ڤەگوهاستن یێن هەردو لایـان پتـر نێزیکی ئێکدو دکەن، و پێکئینان ل سەر دئێتە ئاڤاکرن، و پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((درەوین ئـەو نینە یێ خەلکی پێک دئینت، ڤێجا ئنیەتا خێرێ بینت، یان گۆتنا خێرێ بێژت)).

٦- لادانا کەربێ، و خودێ ب ڤی سالۆخەتی باوەرداران سالۆخ ددەت، دەمێ دبێژت: ﴿ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾ (آل عمران: ١٣٤).

ئـانکو: ئـەوێن د بـەرفرەهی و تەنگاڤییێـدا مـالی خـەرج دکـەن، و کـەربێ دادکەن، و ل مرۆڤان دبۆرن، و خودێ حەز ژ قەنجیکاران دکەت.

٧- هەردو لا ب وێ پێکئینانێ رازی ببن یا دئێتە بەستن.

## ئەنجامێن پێکئینانێ:

پشتی نەڤیان نەمینت، کەرب ڕادوەستت، و گیان زەلال دبـن، و ڕوو گـەش دبـن، و دل نێزیکی ئێکدو دبن، و دا گۆتنا قورئانێ بخوونین دەمێ بەحسێ ڤی حالی دکەت، و دبێژت: ﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴾ (فصلت: ٣٤).

ئانکو: باشی و خرابی وەکی ئێک نابن، تو ب یـا باشـتر خرابییـا وی پالـدە یـێ خرابـی گەهاندییە تە، ب ڤێ چەندێ ئەوێ خرابی گەهاندییە تە و دوژمناتی د ناڤبەرا تـە و ویدا هەی دێ وە لێ ئێت هەر وەکی ئەو دۆستەکێ تە یێ نێزیکە.

## نموونەیەکێ پێکئینانێ:

عومەرێ کوڕێ خەتتابی (خودێ ژێ رازی بت) گۆت: من فلان نەڤێت. هندەکان گۆتە وی زەلامی: عومەری تو نەڤێی.

وی زەلامی گۆتە عومەری: ما من دەرزەک ئێخستییە ئیسلامێ؟

وی گۆت: نە..

گۆت: ما من تاوانەک کرییە؟

عومەری گۆتێ: نە،

وی گۆت: من تشتەکێ نوو د دینیدا دەرخستییە؟

گۆت: نه..

وی زەلامی گۆت: بۆ چ تە ئەز نەڤێم؟

و خودێ دبێژت: ﴿ وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا ﴾ (الأحزاب: ٥٨) و تە ئەز ئێشاندم، خودێ گونەها تە نەغەفرینت!

عومەری گۆت: ئەو ڕاست دبێژت.. و عومەری هیڤی ژێ کرن هەتا ئەو لێبۆری.

## پسیار:

چەند پسیارەکێن بەرسڤێن وان ژ بابەتی دئێنە وەرگرتن:

١- ئایەتەکا قورئانێ بینە فەرمانێ ب پێکئینانێ بکەت.

٢- ئایەتەکێ بینە باوەرداران سالۆخ بدەت کو ئەو خوە ژ کەربڤەبوونێ ددەنە پاش.

٣- ئایەتەکێ بینە ئاشکەرا بکەت کو پشتی پێکئینانێ د ناڤبەرا هەڤرکاندا ڤیان پەیدا دبت.

## چەند پسیارەکێن بەرسڤێن وان ژ شرۆڤەکرنا بابەتی دئێنە وەرگرتن:

١- ب هێزترین و ساناهیترین پێکئینان کیژکە؟ و بۆ چ؟

٢- چەند ڕێک هەنە پێکئینانا دەرڤەیی د ناڤبەرا دو لایاندا پێ چێ دبت، بێی کو لایەکێ سێیێ هەبت، دو ژ وان ڕێکان ئاشکەرا بکە.

٣- پشتی هەڤرکی د ناڤبەرا دو لایاندا پەیدا دبت، و لایەکێ سێیێ دئێت دا وان پێک بینت، چەند ڕێک هەنە کار پێ بێتەکرن، ژ وان: گرتنا هندەک دەرگەهان و گرتنا هندەک دەرگەهێن دی.. ڤێ چەندێ ئاشکەرا بکەت.

## چالاکی:

١- ئەگەر هەڤرکی د ناڤبەرا من و هەڤالەکیدا پەیدابوو، هەر زوو ئەز دێ کاری بۆ نەهێلانا وێ کەم.

٢- ئەگەر کەسەکی تشتەک بۆ من گۆت دا پەیوەندییێ د ناڤبەرا من و هەڤالەکێ مندا خراب بکەت، ئەز گوهدارییا وی ناکەم.

٣- ئەگەر جودابوون و خیلاف د ناڤبەرا دو هەڤالێن مندا پەیدابوو، ئەز دێ کاری بۆ نەهێلانا وێ جودابوونێ کەم.

٤- ئەگەر من هەستکر کو هەڤالەکێ من یێ ژ من دلگران بوویی، بێ کو من گونەهەک هەبت، ئەز دێ حالێ وی بۆ وی ئاشکەرا کەم، و دێ وی ئاگەهدار کەم کو ئەز یێ دلسۆزم بۆ وی.

**نیشانا (دورست) ل بەر دەستەواژەیا ڕاست و یا (خەلەت) ل بەر دەستەواژەیا خەلەت دانە:**

١- مرۆڤ ییَ هاتییە ئافراندن دا ڤەدەر و کووڤی بژیت، نە کو ییَ جڤاکی بت.

٢- ئیسلام وان دەرگەهان ل بەر مرۆڤان دگرت یێن هەڤڕکی تێڕا دەرباس دبت.

٣- کەرب ڤیانێ پەیدا دکەت.

**بەرسڤا دورست د ناڤبەرا دو کڤاناندا بۆ ئەڤێن خوارێ هلبژێرە:**

١- بێ دەنگکرنا کەربێ، تشتەکێ د شیانداىە و ییێ ساناهییە ئەگەر مرۆڤ ......... (نەکەفتە ڕکێ – خوە مەزن نەکەت).

٢- چەند ........... کێمتر لێ بێت هەڤڕکی و سلبوون دێ کێمتر بت ( پێکئینان– ژێکجودابوون).

٣- ............... ڕێکا لێککەفتنێیە (ململانا نەشەریف – ململانا شەریف).

## زانینێن نوو ژ پەند و گۆتنێن عاقلانە:

١- هندی مرۆڤ کاری ب رۆناهییا عەقلی و کاربنەجهییێ بکەت، بەرێ وی دێ کەفتە ڕێکا دورست، و بەرزە نابت.

٢- ئەو مرۆڤێ لەزێ بکەت ڕکا تۆلڤەکرنێ بگرت، دێ پەشێمان بت، بەلێ ل دەمەکی کو پەشێمانی چو مفایی نەدەت.

٣- لێبۆرین ل دەمێ شیانێ باشییەکە پەشێمانی ل دووڤ نائێت.

## ڕەوشەنبیرییا خوەیی:

هیڤییە مامۆستایێ هێژا:

١- پسیارا سالۆخەتێ (پێکئینانا خوە ب خوەیی) ژ قوتابییەکی بکەت کو مفا ژێ دیت بت د هەڤڕکییەکا خوەدا د گەل کەسەکێ دی.

٢- داخوازێ ژ قوتابییەکی بکەت بەحسێ پێکئینانا د ناڤبەرا دو کەساندا بکەت کو ئەو پێ ڕاببت.

وانەیا شازدەیێ:

# ژ ئەحکامێن زەکاتێ

خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ وَآمِنُوا بِمَا أَنْزَلْتُ مُصَدِّقًا لِمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوا أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ . وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (البقرة: ٤١ – ٤٣).

و دبێژت: ﴿ وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾ (البقرة: ١٩٥).



## پێناسە:

زەکات ئەو مالە یێ ژ دەولەمەندان دئێتە وەرگرتن، و بۆ هەژاران –و هندەکێن دی یێن بەحسێ وان د قورئانێدا هاتی– دئێتە دان، ل دووڤ نیسابەکێ دەستنیشانکری.

## زەکات ل سەر کێ یا فەرە:

زەکات ل سەر وی کەسی فەرە یێ مەرجێن فەربوونا زەکاتێ ل نک هەین، ئەو ژی ئەڤەنە:

١– **ئیسلام**: و ئەو ل سەر کافری فەر نینە.

٢– **ئازادی**: و ئەو کەسێ بەنی و کۆلە بت زەکات ل سەر نینە.

٣- **مـال بگەهتـە نيسـابێ (قـەدەركا دەستنيشـانكرى)**: و ئـەو ژ مالـەكى بـۆ ئێكـى يا جودايە، و هەر جارەكا مال نەگەهتە نيسابێ زەكات لێ ناكەڤت.

و دڤێت نيساب ژ هەوجەيێن مرۆڤـى يـێن پێتڤـى زێـدە بت، وەكـى جلـك و خـوارن و ڤەخوارن و ئالاڤێن كارى.

٤- **تمامبوونـا سـالێ**: كـو سـالەكا مشـەختى د سـەر ملكينييـا مرۆڤيـرا بـۆ وى مـالى ببـۆرت، و ئەڤـە مەرجەكـە بـۆ هـەمى مـالێن زەكـات لـێ دكـەڤت، ب تنـێ چاندن و دەرامەت تێ نەبت، ئەو دەمێ دئێتە دورين زەكات لێ دكەڤت.

٥- **ملكينييا تمام بۆ مالى.**

و هندەک مەرج بۆ وى مالى هەنە يێ زەكات لێ دكەڤت، ئەو ژى ئەڤەنە:

١- دڤێت مال ئەو بت يێ زێدە دبت، يان د شياندا بت زێدە ببت.

٢- دڤێت نيساب تێدا هەبت، و نيساب ژ مالەكى بۆ ئێكى يێ جودايە.

٣- دڤێت ملكينييا خودانى بۆ وى مالى يا تمام بت.

٤- دڤێت نيساب ژ هەوجەيێن خودانى يێن پێتڤى زێدە ببت.

٥- دڤێت ئەو مال يێ ڤالا بت ژ وى دەينێ دەمێ دانا وى هاتى.

٦- دڤێت سالەكا مشەختى د سەر وى مالێرا بۆرى بت.

٧- دڤێت مالەكێ حەلال و پاقژ بت.

## ئەو مالێ زەكات ژێ دئێتەدان:

١- زێڕ و زيڤ و پارەيێ كاغەز.

٢- مالێ بازرگانييێ.

٣- حێشتر و چێل و پەزێ چەرێ.

٤- بەرهەمێ دان و دكاك و تۆڤچينييێ.

٥- مەعدەن و تشتێ ژ بن ئەردى دئيننەدەر.

٦- هنگڤين.

٧- پشک و سەنەد و كرێ.

## ئەوێن زەکاتێ وەردگرن:

خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللهِ و اللهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ (التوبة: ٦٠).

١- **ئەو هەژارێ چو مال نەهەی**، و چو کار ژی نەهەین مالێ ئەو هەوجە ببتێ بۆ پێڤە بهێت.

٢- **ئەو هەژارێ هندەک مال هەی بەلێ تێرا وی نەکەت.**

٣- **ئەو کەسێن ب کارێ کۆمکرنا زەکاتێ رادبن**، و ڤان هندەک مەرج هەنە دڤێت ل نک هەبن.

٤- **ئەوێن مە دڤێت دلێن وان ب نک ئیسلامێ ڤە بکێشین**، و ئەڤە دو رەنگن:

أ- ئەو کافرێن ئەم هزر دکەین خێرەکا تێدا هەی و بەلکی موسلمان ببن، یان ژی خرابییا وان ژ موسلمانان بێتە لادان.

ب- ئەو موسلمانێن ئیسلاما وان یا لاواز، دا بەلکی ئیسلاما وان ب هێزتر لێ بهێت، و کەسێن وەکی وان ژی بەر ب ئیسلامێ ڤە بهێن.

٥- **بەنی و کۆلە (عەبد) ژ ژن و مێران**، دا ئەو خوە پێ بکڕن و ئازاد ببن، و ئازادکرنا ئێخسیران ژی وەکی ڤێیە.

٦- **دەیندار**، و نە هەر دەیندارەکێ هەبت زەکات بۆ دئێتە دان، بەلکی هندەک مەرج هەنە دڤێت ل نک هەبن.

٧- **د رێکا خودێدا**، و مەبەست پێ جیهادا د رێکا خودێدایە، ب رامانا وێ یا بەرفرەهـ ڤە، وەکی فقهزان دبێژن، کو هەر تشتەکە یێ دین پێ دئێتە پارستن، و هەر تشتەکێ خزمەتا بەرژەوەندێن موسلمانان یێن گشتی بکەت. و بەرەڤانی ژ ئەرد و وەلاتی بێتەکرن.

٨- **رێڤنگ**، ئەوێ ژ جهێ خوە دوورکەفتی، و دەستێ وی نەگەهتە مالێ وی، و ئەڤی ژی هندەک مەرج بۆ هەنە.

هەر وەسا بارا پتر ژ زانایێن موسلمانان ژ سەحابییان و یێن پشتی وان ل وێ باوەرێنە کو هەر مالەکێ بۆ بازرگانییێ هاتیە ئامادەکرن زەکات لێ دکەڤت، و دەلیلێ وان ئەڤ گۆتنا خودێیە: ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً ﴾ (التوبة: ١٠٣).

## چاوا زەکاتا مالێ بازرگانییێ دئێتەدان:

ئەگەر بازرگان مالێ خوە ب پارەیێ حازر بفرۆشت، و خوە لێ نەگرت حەتا بهایێ وی زێدە بت یان بازار گران بت، هەر سال ئەو دێ مالێ خوە بها کەت، ئەگەر خوە ئەو چەند سال ژی بت ئەو مال ل نک وی، و وی بهایی د گەل مالێ خوە یێ دی هەمییێ دێ هژمێرت و زەکاتا وی دەت، و ئەگەر وی هندەک مال ب دەین فرۆت بت، و دەمێ وەرگرتنا دەینی هات بت، و وی هێڤیا وەرگرتنێ هەبت، ئەو زەکاتا وی مالی ژی دێ دەت. بەلێ ئەو دەینێ وی دایە کەسەکێ مال نەبت، یان کەسەکێ ژ زۆرداری دەینێ خوە نەدەت، ئەو دەینێ وی مالی نادەت، هەتا دەینێ خوە وەردگرت، و هەر جارەکا وی دەینێ خوە وەرگرت ئەو زەکاتا سالەکێ دێ دەت، بلا گەلەک سال د سەر را بۆری بن ژێ.

و بازرگان زەکاتا وی مالی نادەت یێ زێدە نەبت، وەکی ئالاڤ و ئامیرەتێن وەکی: تەرازییێ و ئامانێن پەرتالان دکەنە تێدا، و تشتێن وەکی وان.

## پسیار:

١- مەرجێن دانا زەکاتێ چنە؟

٢- زەکات بۆ کێ دئێتەدان؟

٣- ئەوێن زەکات بۆ دئێتەدان دا دلێن وان ب نک ئیسلامێ ڤە بینەکێشان کینە؟

٤- دەلیلێ زانایان ل سەر فەربوونا دانا زەکاتا د وی مالیدا یێ بۆ بازرگانییێ هاتییە ئامادەکرن چیە؟

## چالاکی:

ڤان ئایەتان ژ بەر بکە: ﴿ وَآمِنُوا بِمَا أَنْزَلْتُ مُصَدِّقًا لِمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوا أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (البقرة: ٤١ – ٤٣).

## وانەیا هەڤدەیێ:

# مفاییێن دانا خێران

ژ خەسلەتێن باش یێن ئیسلامێ بەرێ مە دایێ دانا خێرانە، و ئەو ژ رەوشتێ پێغەمبەر و چاکانە، و ئەو ژ سالۆخەتێن باوەردارانە. و موسلمانێ دورست ئەوە یێ ئەڤ سالۆخەتە ل نک هەی، و ب مالێ خوە و کارێ خوە و هەتا گۆتنا خێرێ هاریکارییا خەلکی دکەت، و گەلەک رەنگێن خێرێ هەنە، بۆ نموونە: دانا مالی بۆ مرۆڤێن پێتڤی و هەژار، و پشکدارییا د پرۆژەیێن خێرخوازییێدا، و دانا خوونێ، و پشکدارییا د ئاڤاکرنا خانییەکی یان کۆلانا بیرەکێدا، و ڕاکرنا ئاستەنگەکێ ژ ڕێکێ، و گۆتنا باش و شیرەتکرن، ئەڤە هەمی خێرن، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((الكَلِمَةُ الطيِّبَةُ صَدَقَةٌ)) ئانکو: گۆتنا باش خێرە.

## مفاییێن خێرێ:

١- گونەهێ ژێ دبەت.

٢- بەلایێ باشڤە دبەت.

٣- بەرەکەتێ دهاڤێتە مال و ساخلەمییا خێرکەری، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((مَا نَقَصَ مالٌ مِنْ صَدَقَةٍ)) ئانکو: خێر چویێ ژ مالی کێم ناکەت.

٤- دبتە دەرمان بۆ دەردان.

٥- نیشانا ڕاستگۆییا موسلمانییە د گەل خودێ.

٦- خێرکەر هەردەم ب ڕحەتییا دلی و فرەهییا سنگی دحەسییێت.

## خێرا بەردەوام:

ئەو خێرە یا خودێ بەردەوام خێرێ ژێ ددەتە خودانی هەتا پشتی مرنا وی ژی، ژ بەر کو باشییا وێ یا بێ دووماهییە، وەکی بەری نوکە د وانەیەکێدا د گەل مە بۆری. و ژ نموونەیێن خێرێن بەردەوام:

١-ئاڤاکرنا مزگەفت و قوتابخانە و خەستەخانە و هەر ئاڤاهییەکێ خزمەتەکا گشتی بۆ جڤاکێ پێشکێش بکەت، یان پشکدارییا د ئاڤاکرنا واندا.

٢- كۆلانـا بيـرێن ئـاڤێ، يـان ڕێكخسـتنا سۆلين و تـۆڕێن ئـاڤێ، چ بـۆ ڤـەخوارنا مرۆڤان بت يان ئاڤدانا داروباران.

٣- بـەلاڤكرنا زانينــێ ب ڕێكـا دەرسـدانێ، يــان پێشكێشـكرنا پـەرتووكێن دينــى و زانستى، يان دورستكرنا پەرتووكخانەيێن گشتى دا قوتابى مفايى ژێ ببينن.

٤- ڤەكرنا ڕێک و پران، ب تـايبەتى ل دەڤەرێن زێدە پێتڤى، ل وان جهان يـێن خـەلكێ هەژار لێ دژين.

## دان وستاندن:

١- موسلمانێ دورست كييە؟

٢- مفايێن دانا خێران چنە؟

٣- خێرا بەردەوام چيە؟

## ڤان دەستەواژەيان تمام بكە:

١- هاريكاريا خەلكى ب مالى يان ............ يان ............ دئێتەكرن.

٢- دانا خێران ژ ڕەوشتێ ............ نە.

٣- پەيڤا باش ............

٤- خودێ بەرەكەتێ دهاڤێتە ........... و .......... خێركەرى.

## چالاكى:

ڤێ ئايەتێ و ڤێ فەرمۆدەيێ ژ بەر بكە:

١- خودايێ مەزن دبێژت: ﴿ مَثَلُ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ (البقرة: ٢٦١).

٢- پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((مَا نَقَصَ مَالٌ مِنْ صَدَقَةٍ)).

وانەیا هەژدەیێ:

## ژ مافێن موسلمانی ل سەر موسلمانی

## نەبەلاڤکرنا گۆتنێن خراب و نهێنییان

بێ گومان ئەڤ دەمێ ئەم ل دژین گەلەک کێمە کەسەکێ ئەمین ل سەر نهێنییێن مرۆڤان تێدا هەبت، کو گۆتنێن خراب د دەر هەڤێ واندا بەلاڤ نەکەت، و بارا پتر ژ مرۆڤان -ئەو تێ نەبت یێ خودێ رەحم پێ بری- نهێنییان ناپارێزن، بەلکی وان بەلاڤ دکەن، هەر چەندە بەلاڤکرنا نهێنییان رەنگەکێ خیانەتییە. ژ بەر ڤێ چەندێ فەرمۆدەیا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بەحسێ خێرا پارستن و ڤەشارتنا نهێنییێن مرۆڤان بۆ مە دکەت، و بەرێ مە ددەتە ڤێ چەندێ؛ دا جڤاک پارستی ژ (کەرب و کین و نەڤیانێ) بمینت، و دا ڤیان بەلاڤ ببت، و موسلمان ب ئاشتی بژین. ئەبوو هورەیرە دبێژت: پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ)).

ئانکو: نیشانێن دوروویی سێنە: ئەگەر ئاخفت درەوێ دکەت، و ئەگەر پەیمان دا ب جهـ نائینت، و ئەگەر ئێکی باوەرییا خوە پێ ئینا خیانەتێ دکەت.

و ژ تۆرەیێن فەر کو ل نک موسلمانی هەبن ئەوە ئەو ب خرابی بەحسێ کەسێ نەکەت، و کێماسییێن وی د ناڤ مرۆڤاندا بەلاڤ نەکەت، چ ئەو یێ ئامادە بت یان نە، ژ بەر کو ئەو دبتە ئەگەرا:

١- خرابوونا پەیوەندییان.

٢- پەیدابوونا هەڤرکییان.

٣- هلوەشیانا کەسینییێ.



و تشتەکێ سورشتییە ئەم بەر ب ڤیان و حەژێکرنێ ڤە بچین، ژ بەر کو ئەو خێرێ ب دەست موسلمانی ڤە دئینن، و موسلمانی خرابی نەڤێت نە بۆ خوە و نە بۆ خەلکی.

ئەنەس دبێژت: پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((مَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا شَانَهُ، وَلَا كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا زَانَهُ)).

ئانکو: بێشەرمی د تشتەکیدا نابت ئەگەر وی کرێت نەکەت، و شەرم د تشتەکیدا نابت ئەگەر وی جوان نەکەت.

و دو تشت نەبەلاڤکرنا خرابییێ جوان دکەن: عەقل، و رەوشتێ باش.

## حوکمێ بەلاڤکرنا نهێنییان:

و بەلکی کەسەک پسیار بکەت و بێژت: حوکمێ بەلاڤکرنا نهێنییان چیە؟

ئیمامێ غەزالی دبێژت: ئەم یێن ژ وێ چەندێ هاتینە پاشڤەبرن، ژ بەر کو نەخوەشی بۆ هەڤالان تێدا هەیە، و مافێ وان ژی پێ دئێتە خوارن، و ئەو حەرامە ژ بەر کو زیان تێدا هەیە. و پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((باوەرییا ئێک ژ هەوە تمام نابت هەتا وی ئەو بۆ برایێ خوە بڤێت یا وی بۆ خوە دڤێت)).

## کەنگی گۆتن دبتە نهێنی و نابت بێتە بەلاڤکرن:

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((ئەگەر زەلامی ئاخفتنەک گۆت پاشی ل خوە زڤڕی ئەو ئێمانەتە)) ئانکۆ: دەمێ ئاخفتنکەر ل خوە دزڤڕت، ئەو یێ کەسێ بەرانبەر ئاگەهدار دکەت کو ئەو دترست کەسەکێ دی گوهـ ل گۆتنا وی ببت، و هەر وەکی وی ب زڤڕینا خوە دڤێت بێژتێ: ئەڤ گۆتنا من ئێمانەتە ل نک تە و بۆ کەسێ نەبێژە. و ئەڤە تۆرەیەکێ مەزنە پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) نیشا مە ددەت، دەمێ ئەو زڤڕینا زەلامی بۆ لایێ چەپ و ڕاستێ ل شوونا سپارتنا نهێنییێ ددانت.

## بەلاڤکرنا نهێنییێ بۆ بەرژەوەندێ:

ڤەشارتنا نهێنییان ژ رەوشتێن چاکانە، و ئەگەر بەرژەوەندەک یان پاشڤەبرنا زیانەکێ د بەلاڤکرنا نهێنییەکێدا هەبت، دورستە ئەو نهێنی بێتە بەلاڤکرن، و خودایێ مەزن د فەرمۆدەیەکا قودسیدا دبێژت: ((لێبۆرینا من ژ هندێ مەزنترە کو ئەز د دنیاییدا موسلمانەکی ستارە بکەم، پاشی شەرما وی ببەم، و ئەز هەر دێ مینم گونەهێ بۆ بەنییێ خوە ژێ بەم هندی ئەو داخوازا ژێبرنێ ژ من بکەت)).

و وەکی د فەرمۆدەیا قودسیدا هاتی نەبەلاڤکرنا نهێنییان قانوونەکا خوداییيە، و خودایێ مەزن بەنییێ خوە ستارە دکەت، هندی ئەو داخوازا لێبۆرینێ بکەت، ڤێجا ئەو کەسێ نهێنی و کێماسییا کەسەکێ دی بزانت بلا وی د دنیایێدا ستارە بکەت، دا خودایێ مەزن د دنیایێ و ئاخرەتێدا وی ستارە بکەت.

## ڕەنگێن نهێنییان:

١- ئەو تشتێ شریعەتی فەرمان ب ڤەشارتنا وی دایی.

٢- ئەو تشتێ خودان بخوازت بێتە ڤەشارتن.

٣- ئەو تشتێ هێژایی ڤەشارتنێ بت، بەلێ ژ بەر پێتڤییێن کاری ئەو نهێنی بێتە زانین.

## دان و ستاندن:

١- ئاشکەراکرنا خرابییان دبتە ئەگەرا:

أ- .................. ب- .................. ج- .....................

٢- ڕەنگێن نهێنییان:

أ- .................. ب- .................. ج- .....................

٣- دو تشت نەبەلاڤکرنا خرابییێ جوان دکەن:

أ- .................. ب- .............

٤- کەنگی بۆ مە دورستە ئەم نهێنییان بەلاڤ بکەین؟

٥- حوکمێ بەلاڤکرنا خرابییان چیە؟



### وانەیا نۆزدەیێ:

# هلگرتنا متایی دا گران بت

# (ئحتیکار)

هندەک کەس متایی (تشتێ خوارنێ یێ فەر) دکڕن، و ڤەدشێرن و عنبار دکەن، هەتا بهایێ وی گران بت، پاشی وی دئینن و ب گرانی دفرۆشن، ئەڤی کاری دبێژنێ: (ئحتیکار)، ئانکو: ئحتیکار هلگرتنا متایە دا ئەو ل بازارێ کێم ببت، و بهایێ وی گران ببت، و مرۆڤ بکەڤنە تەنگاڤییێ.

## ڕەنگێن ئحتیکارێ:

گەلەک ڕەنگێن ئحتیکارێ هەنە، ژ وان:

١- ئحتیکارا هندەک مرۆڤێن کێم: کو هژمارەکا کێم یا بەرهەمداران یان دکانداران بەرهەمئینانا تشتەکی بێخنە دەستێ خوە ب تنێ، دا بشێن بهایێ وی ب دلێ خوە گران بکەن.

٢- ئحتیکارا پێگوهۆڕک: کو بەرهەمدارەک یان دکاندارەک تشتەکێ بکڕەکێ ب تنێ هەی هلگرت، دا پاشی هەر لایەک خوە ل سەر یێ دی گران بکەت.

٣- ئحتیکارا تمام: کو مرۆڤەک تشتەکی هلگرت و نەفرۆشت هەتا گران دبت، و ئەو تشت ل نک کەسێ دی ل چو جهان نەبت.

٤- ئحتیکارا دەولەتێ: کو دەولەت دەستێ خوە بدانتە سەر بەرهەمئینان و فرۆتنا تشتەکی، و بەلکی ئەو ڤێ چەندێ بکەت دا ئەو بەرهەم کێم ببت، یان دا ب ڕەنگەکێ خراب ئەو خوە ژ هندەکێ ژ وی تشتی ڕزگار بکەت، و ب وی بهایێ دەولەتێ دڤێت.

## خرابی و مەترسییێن ئحتیکارێ:

د گەل هەبوونا هژمارەکا سیستەمێن ئابۆری ل جیهانێ هژمارەکا سیستەمێن ئحتیکارێ ژی هەنە، د سیستەمێ هەڤپشکییێدا دەولەت ئحتیکارێ دکەت، و د سیستەمێ سەرمالییێدا کەس ئحتیکارێ دکەن، و ل هەردو دەمان ئەنجام ئێکە،

هژمارەکا مەترسی و خرابییان ل سەر دەولەتێ و ل سەر کەسان ژی پەیدا دبن، ژ وان:

١- ئحتیکار گیانێ ململانا شەریف د ناڤ کەس و دەولەتاندا دکوژت، ئەو ململانا دبتە ڕێکا باشکرن و پێشڤەبرنا کاری.

٢- دبت ئحتیکار بەرێ خودانێ خوە بدەتە هندێ کو ئەو هندەک مالێ خوە پووچ بکەت، بسوژت یان بهاڤێتە د دەریاییدا، دا بهایێ وی مالی ئەرزان نەبت.

٣- ئحتیکار دبتە ئەگەرا بەلاڤبوونا کەرب و نەڤیانێ د ناڤ مرۆڤاندا، تشتێ جڤاکێ ژێکڤە دکەت، و پەیوەندییان د ناڤبەرا خەلکیدا دهەرێفت.

٤- ئحتیکار گەلەک ئێشێن ئابۆری و جڤاکی پەیدا دکەت، وەکی: بێکاری و کەساد و بەرتیل و دوڕوویاتی و دزی و غشێ.

## ئیسلام و شەڕێ ئحتیکارێ:

بەرانبەر ڤان مەترسییان، ئەم دبینین ئیسلام شەڕێ ئحتیکارێ دکەت، و شەڕێ وان کەسان ژی یێن ئحتیکارێ دکەن، ئەوێن دلڕەشی و ڕژدییا وان ل سەر کۆمکرنا مالی بەرێ وان ددەتە بازرگانییا ب قووت و رزقێ مرۆڤان، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((هەچییێ تشتەکی ڤەشێرت دا ل سەر موسلمانان بکەتە گرانی، ئەو یێ گونەهکارە)) ئەحمەد ڤەدگوهێزت، و دبێژت: ((هەچییێ خوارنا موسلمانان ل وان ڤەشێرت خودێ دەستێن وی ببڕت و مالێ وی ببەت)) ئبن ماجە ڤەدگوهێزت، و دبێژت: ((ب تنێ گونەهکار ئحتیکارێ دکەت)) ئەحمەد و موسلم و ئەبوو داوود ڤەدگوهێزن.

## ئەگەرێن پەیدابوونا ئحتیکارێ:

١- کڕین یان چێکرنا وی تشتێ خەلک هەوجە دبتێ -بێی مرۆڤ پێتڤی وی تشتی بت- دا خەلک وی نەکڕن یان چێ نەکەن.

٢- هلگرتنا تشتان ب مەرجەکی هلگرتن سالەکێ بت و زێدەی هەوجەییا مرۆڤی بت.

٣- ئارمانج ژ هلگرتنێ ئەو بت بها گران ببت، ژ بەر کو خەلکی پێتڤی ب وی تشتی هەیە یێ ژ بازارێ دئێتە ڕاکرن.

٤- کو هلگرتن زیانێ بگەهینتە خەلکی و ببتە ئەگەرا پەیدابوونا هندەک خرابییان وەکی بازارا ڕەش.

## رێكێن نەهێلانا ئحتیكاریێ:

ئیسلامێ رێ نەدایە ڤی دەردێ كوژەک كو جڤاكێ بهەرفینت، و خرابییێ لێ بەلاڤ بكەت، و گەلەک رێک بۆ چارەسەرییا ڤی دەردی دانانە ئەگەر هات و ئەو بەلاڤبوو. ژ وان رێكان:

١- كاربدەست یان حاكم دڤێت ئاگەهدارییا وان كەسان بكەت یێن ئحتیكارێ دكەن كو ئەو وان تشتان ب بهایەكێ گونجایی بفرۆشن، و ئەگەر وان ئەڤ چەندە نەكر، دورستە بۆ حاكمی وان تشتان ژێ بستینت و ببەت و بفرۆشت، دا تەنگاڤی نەمینت، و زۆرداری ژ سەر خەلكی رابت.

٢- دڤێت دەولەت وی متایێ پێتڤی ئەوێ ژ بەر ئحتیكارێ ل بازارێ كێمبووی پەیدا بكەت، ب رێكا زێدەكرنا بەرهەمئینانێ، دا بها گران نەبت، و ب ڤێ چەندێ ئارمانجا وان كەسێن ئحتیكارێ دكەن ب جهـ نائێت.

٣- دڤێت دەولەت بازرگانان هان بدەت كو بازرگانییا خوە زێدەتر لێ بكەن، دا ئەو تشتێن مللەت هەوجە دبتێ ل بازارێ كێم نەبت.

٤- دڤێت دەولەت بهایی بدانتە سەر كەل و پەلان، ب رەنگەكێ وەسا زۆرداری نە ل بكڕی بێتەكرن نە ل دكانداری، و د ڤێ چەندێدا دڤێت ب گۆتنا مرۆڤێن بسپۆر و شارەزا بێتەكرن، و دانانا بهایی ژ لایێ دەولەتێ ڤە پشتی ب كارئینانا هەمی رێكێن بۆرین دئێت، ژ بەر كو دبت دانانا بهایی رەنگەكێ زۆردارییێ تێدا هەبت، هەر وەسا ئەو دبتە گرێدان بۆ ئازادییا كڕین و فرۆتنێ. و جارەكێ ل سەر دەمێ (سلاڤ لێ بن)بهایێ تشتان گران بوو، هندەكان گۆتە پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن): بهایی بۆ مە بدانە سەر تشتان، وی گۆت: ((خودێیە رزقی كێم دكەت و بەرفرەهـ دكەت، و ئەوە رزقی ددەت و بهایی ددانت، و ئەز هیڤی دكەم دەمێ ئەز دچمە نک خودایێ خوە، كەس ژ هەوە گازندەیێ ژ من نەكەت سەرا زۆرداریيەكێ كو من د خوونەكێ یان مالەكێدا گەهاندبتێ)) (ترمزی و ئەبوو داوود و ئبن ماجە ڤەدگوهێزن)، ئانكو: دانانا بهایی - ئەگەر تشتەكێ پێتڤی نەبت- رەنگەكێ زۆردارییێ تێدا هەیە..

و ئحتیكارێ رەنگەكێ كەیسێ و یاریكرنا ب بهایی تێدا هەیە، و بەرژەوەندا خەلكی د هندێدایە دەولەت مایێ خوە تێ بكەت، و بهایی بدانتە سەر تشتان، وەک جزایەک بۆ ڤان كەسێن دلڕەش. و ب ڤی رەنگی ئیسلام ب شریعەتێ خوە داخوازا دادی و دلفرەهی و خێرخوازییێ دكەت، و شەڕێ هەر تشتەكێ خراب دكەت یێ زیانێ بگەهینتە جڤاكێ.

## پسیار:

١– مەبەست ب ئحتیكارێ چیە؟

٢– چەند ڕەنگێن ئحتیكارێ هەنە؟

٣– مەترسی و خرابیێن ئحتیكارێ چنە؟

٤-ڕێكێن چارەسەرییا ئحتیكارێ چنە؟

## چالاكی:

ڤان هەردو فەرمۆدەیان ژ بەر بكە:

١- ﴿ مَنْ احْتَكَرَ حُكْرَةً يُرِيدُ أَنْ يُغْلِيَ بِهَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ فَهُوَ خَاطِئٌ ﴾.

٢- ﴿ مَنِ احْتَكَرَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ طَعَامَهُمْ، ضَرَبَهُ اللهُ بِالْجُذَامِ، وَ الْإِفْلاسِ ﴾.

وانەیا بیستێ:

## ژ سەرهاتیێن پێغەمبەران

### ٢-بوونا مووسایی سلاڤ لێ بن

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ ۝٤ وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ۝٥ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُمْ مَا كَانُوا يَحْذَرُونَ ۝٦ وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ۝٧ فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ ۝٨ وَقَالَتِ امْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَى أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ۝٩ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا إِنْ كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَنْ رَبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ۝١٠ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِ عَنْ جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ۝١١ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِنْ قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ ۝١٢ ﴾ (القصص: ٤-١٢).

مووسا (سلاڤ لێ بن) ئێک ژ وان پێغەمبەرانە یێن دووکەفتییێن هەر سێ دینان: جوهی و مەسیحی و موسلمان، باوەرییێ پێ دئینن، مووسا -وەکی تەورات و قورئان دبێژن- ل سەر دەمێ فیرعەونی[1] ل مسرێ هاتبوو سەر دنیایێ، و هەر ل وێرێ هاتبوو پەروەردەکرن، و فیرعەونی -ئەوێ هنگی فەرمانداری دکر- د خەونا خوەدا دیتبوو کو ئاگرەک ژ ناڤ ئسرائیلییان دەردکەفت و ئەو و ملکێ وی دسۆت، و هندەکان ئەڤ خەونا وی وەسا شرۆڤەکربوو کو زەلامەک د ناڤ ئسرائیلییاندا دێ بت، ملکێ وی دێ ژ وی ستینت.

ژ بەر ڤێ چەندێ فیرعەونی بڕیار دا لەشکەرێ خوە کو هەر زارۆکەکێ کوڕ یێ د ناڤ ئسرائیلییاندا ببت ئەو وی بکوژن، و دەیکا مووسایی ترسیا کو لەشکەرێ فیرعەونی کوڕێ وێ ببەن و بکوژن، ئەو وێ ئەو کرە د سندۆقەکا دەپیدا و هاڤێتە د ڕووباریدا. و ڕووباری ئەو سندۆق بر هەتا گەهاندییە قەسرا فیرعەونی، و ژنا فیرعەونی ئاسیایا کچا موزاحمی ئەو ژ ئاڤێ ئینادەر و بۆ خوە بر، و وەکی کوڕێ خوە هژمارت.
نێزیکی (٥٠٠) سالان پشتی مرنا یووسفی (سلاڤ لێ بن) ، ئانکو نێزیکی (١٩٨٢) سالان بەری بوونا مەسیحی (سلاڤ لێ بن) ، مووسا هاتبوو سەر دنیایێ، و ئەو کێمتر ژ (١٠٠) سالان ژیابوو، و خودێ باشتر دزانت.

---

(١) هندەک دبێژن: ئەڤ فیرعەونە مەلک رمسیسێ دویێ بوو، بەلێ ئەڤ چەندە نە یا مسۆگەرە.

بەری بوونا مووسایی زۆرداریيەکا مەزن ژ لايێ فيرعەونی ڤە ل عبرانييان ل مسرێ دهاتە کرن.

سێ هەيڤان دەيکا مووسايی شير دايێ، پاشی ترسيا ئەو ئاشکەرا ببت، و لەشکەرێ فيرعەونی پێ بحەسن، لەو وێ ئەو کرە د سندۆقەکێدا و هاڤێتە د نيليدا. و ئاڤێ سندۆق هاژۆت، هەتا برييە نک قەسرا فيرعەونی ئەوا ل بەر لێڤا ئاڤێ، و ئاسيايێ داخواز ژ فيرعەونی کر ئەو وی نەکوژت، دا بۆ وان ببتە بيناهييا چاڤان، و بەلکی ئەو ل هيڤييا کورەکی بوون، و گۆتێ: بەلکی ئەم مفايی بۆ خوە ژێ وەرگرين ئەگەر ئەو ل نک مە مەزن بوو، يان ئەم وی بۆ خوە بکەينە کوڕ.

و وان ناڤێ وی کرە: (مووسا) ئانکو: ئەوێ ژ ئاڤێ هاتييە دەرێخستن.

و دەمێ دەيکا مووسايی زانی کو کوڕێ وێ ڕزگار بوو و نوکە يێ ل قەسرا فيرعەونی، دلێ وێ رحەتبوو و ژ خەم و کۆڤانان ڤالابوو، و ژنێن قەسرا فيرعەونی بۆ ڤی زارۆکی ل داييناکێ گەڕيان دا شيرێ بدەتێ، و هەر جارەکا وان داييناک ئينابا، زارۆکی شيرێ وێ نەدخوار.



خودێ ل سەر وی حەرامکر ئەو شيرێ ژنکەکێ بخوت، دا جارەکا دی ئەو وی بزڤڕينتە نک دەيکا وی، و دەمێ خويشکا وی مەريەمێ ديتی ئەو گەلەک حەز ژ مووسايی دکەن و يێن ل داييناکێ دگەڕيێن بۆ وی، وێ گۆتە وان: ئەرێ ئەز خەلکێ مالەکێ نيشا هەوە بدەم، دێ شيری دەنە وی و وی خودان کەن؟

ئەو رازی بوون، و وێ ئەو برە نک دەیکا وی، و دەمێ وی شیرێ وێ گرتی، زەلامێن فیرعەونی ئەو ب کرێ گرت دا شیری بدەتێ.. و ب ڤێ چەندێ خودێ مووسا زڤڕاندە نک دەیکا وی؛ دا چاڤێن وێ پێ روهن ببن، و ب خەم نەکەڤت، و دا بزانت کو ئەو سۆزا خودێ بەری هنگی دایێ کو کوڕێ وێ بۆ بزڤڕیت هەقە، و هەر دێ ب جهـ ئێت.

دەمێ شیردانا مووسایی ب دووماهی هاتی، ئەو جارەکا دی بۆ قەسرا فیرعەونی هاتە ڤەگەڕاندن، و ل وێرێ هاتە پەروەردەکرن هەتا مەزن بووی، و خودێ عەقل و هێز و شیان دانێ. و ژ بەر کو خودێ حەزکربوو وی بکەتە پێغەمبەرەکێ خودان بها، وی زانین و کاربنەجهی دانێ.

گومان تێدا نینە کو پەیوەندییا مووسایی د گەل داییـنا وی -دەیکا وی یا ژ ڕاستی- هەر مابوو، و وی ژ وێ و ئەندامێن دی یێن مالباتا خوە زانیبوو کانێ ئەو کییە، و وان سەرهاتییا بوونا وی و ڕەنگێ چوونا وی بۆ قەسرا فیرعەونی زانیبوو، و وان بۆ وی ئاشکەرا کربوو کو ئەو ژ ئسرائیلییانە. و ژ بەر جهـ و بهایێ وی ل قەسرا فیرعەونی وی کار بۆ هندێ کر کو ئەو هندەکێ ژ وێ زۆرداریێ سڤک بکەت ئەوا ژ ئسرائیلییان دگرت.

## مفایێ سەرهاتیێ:

هێز و شیانا خودێ ژ سەرهاتییا بوون و پەروەردەکرنا مووسایی بۆ مە ئاشکەرا دبت، و کو هەر تشتەکێ وی بڤێت ئەو دکەت، خودێ وەسا حەز کر پێغەمبەرێ وی ل مالا دوژمنێ وی مەزن ببت، پاشی وی ئەو کرە پێغەمبەر و فەرمان لێ کر ئەو پەیاما وی بگەهینتە فیرعەونی، ئەڤەیە حەزکرنا خودێ یا چو کەس و چو هێز نەشێن ڕێ لێ بگرن، ئەو خودایێ ئەگەر ڤیا تشتەکی بکەت، ئەو وی تشتی ب ڕێکا لەشکەرەکێ لاواز -ل بەر چاڤێن خەلکی- ب جهـ دئینت، خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ ﴾ (المدثر: ٣١).



## پسیار:

١- مووسا (سلاڤ لێ بن) ل كیژ جهی هاتبوو سەر دنیایێ؟

٢- بۆ چ فیرعەونی بڕیار دابوو زارۆكێن ئسرائیلییان یێن كوڕ بكوژت.

## دان و ستاندن:

چ مفا د سەرهاتییا بوونا مووسا پێغەمبەریدا (سلاڤ لێ بن) هەیە؟

### وانەیا بیست و ئێکێ:

# چەند دیمەن ژ ژیانا سەحابییان

## عومەر و دەیکا ئێتیمان

شەڤەکێ عومەرێ کورێ خەتتابی (خودێ ژێ رازی بت) ل دۆر و رەخێن مەدینێ دگەریا، دا حالێ خەلکی بزانت، و خولامێ وی (ئەسلەم) ژی د گەل بوو، وی ئاگرەکێ هلکری ژ دوور ڤە دیت گەش دکر، ئەو ب لەز چوونە نک وی ئاگری، و دەمێ ئەو نێزیک بووین، عومەری ژنەک ل وێرێ دیت، ئاگرەک هلکربوو، و قازانەک دانابوو سەر ئاگری، و چەند زارۆکەک ل دۆر وێ بوون دکرنە گری.

عومەری پسیارا وێ ژن کر کانێ بۆ چ ئەڤ زارۆکە دکەنە گری؟

وێ گۆت: ئەو ژ برسادا یێن دکەنە گری.

عومەری گۆت: پا ئەڤ قازانا ل سەر ئاگری چیە؟

وێ گۆت: من قازان یا تژی ئاڤ کری، دا ئەو پێ تەنا ببن، هەتا خەوا وان دئێت و ئەو دنڤن.. و خودێ د ناڤبەرا مە و عومەری دا بت!

و وێ نەدزانی کو ئەو عومەرە، عومەری گۆتێ: خودێ رەحمێ ب تە ببەت، ما عومەر چ ژ حالێ تە دزانت؟

ژنکێ گۆت: عومەر دبتە مەزنێ مە، و مە ژ بیر دکەت!

عومەری ب گۆتنا وێ تێکچوو، و دلێ وی ژ دیمەنێ وان زارۆکان ئێشا ئەوێن ژ برسادا دکرنە گری، لەو وی ژی کرە گری.. پاشی ئەو و خولامێ خوە ب لەز چوونە وی جهی یێ مالێ خێرێ لێ هاتیە هلگرتن، و ئامانەک ئینا و تژی ئار و زەیت و قەسب کر، وهندەک جلک ژی بۆ وان ئینان، و عومەری ئەو تشت ل پشتا خوە کرن، و هندی خولامێ وی ئەسلەمی گۆتێ: ئەی ئەمیرلموئمنین ئەز دێ هلگرم. عومەری گۆتێ: بدانە سەر پشتا من، ما تو دێ بارێ من یێ گونەهان پێش من ڤە هلگری رۆژا قیامەتێ؟



و عومەر ب لەز چوو وی جهێ ژن و زارۆکێن وێ لێ، و ئەو تشت دانانە بەر، دا ئەو هندەک خوارنێ بۆ وان چێ کەت، و عومەری پف کرە کوچکی دا ئاگر خوەش ببت، هەتا زاد چێبووی، و گاڤا عومەری دیتی زارۆکان خوارن خواری و کەیفا وان هاتی، کەیفا عومەری ژی گەلەک هات، و دەمێ وێ ژنکێ پسیارا عومەری کری کانێ ئەو کییە؟ وی گۆتێ: سوباهی هەرە نک ئەمیرلموئمنینی دێ من ل وێرێ بینی.

و رۆژا دی دەمێ ئەو ژنک چوویە نک عومەری، و زانی ئەو زەلام عومەر ب خوەیە، ئەو ترسیا، عومەری گۆتێ: نەترسە.. پاشی فەرمان دا راتبەک ژ مالێ دەولەتێ بۆ وێ و زارۆکێن وێ بێتەدان.

## دان و ستاندن:

١- عومەرێ کورێ خەتتابی کییە؟

٢- بۆ چ عومەر ب شەڤێ دەرکەفتبوو؟

٣- بۆ چ زارۆکان دکرە گری؟

٤- گۆتنا ژنکێ ئاشکەرا بکە دەمێ گۆتی: (عومەر دبتە مەزنێ مە و مە ژ بیر دکەت).

٥- عومەری چ گۆتە خولامێ خوە دەمێ وی ڤیای پێش وی ڤە تشتان هلگرت؟

٦- عومەری چ فەرمان بۆ ژنێ و زارۆکێن وێ دا دەمێ ئەو رۆژا دی چوویە نک وی؟

٧- چ مفایی ئەم ژ ڤێ سەرهاتییێ وەردگرین؟

وانەیا بیست و دویێ:

# عەلییێ کورێ ئەبووتالبی

## خودێ ژێ رازی بت

### ناڤ و ناسناڤێ وی:

عەلی کورێ ئەبووتالبییە (ناڤێ ئەبووتالبی یێ دورست عەبدمەنافە) کورێ عەبدلموتتەلبێ کورێ هاشمییە، پسمامێ پێغەمبەرییە (سلاڤ لێ بن) .

ژ بەر کو ناڤێ کورێ وی یێ مەزن حەسەن بوو دگۆتنێ: بابێ حەسەنی، و ناسناڤێ وی (ئەمیرلموئمنین) بوو، و ئەو خەلیفێ راشدی یێ چارێ بوو.

### خوەگۆریکرنا وی:

دەمێ ئووجاخا قورەیشییان کۆمبووی و بڕیار دای پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بکوژن، خودێ پێغەمبەرێ خوە ب وێ چەندێ ئاگەهدارکر، و ژ بەر کو پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) مرۆڤەکێ زێدە کاربنەجھ بوو، وی فەرمان دا عەلی وێ شەڤێ ل سەر جهێ وی بنڤت، و گۆتێ: ((ل سەر جهێ من بنڤە، و ڤێ کراسێ من بکە بەر خوە، و تشتەکێ تە پێ نەخوەش بت ناگەهتە تە)).



## گرنگترین کارێن وی پشکداری تێدا کری:

نڤیسەرێن دیرۆکێ هەمی دبێژن: عەلی (خودێ ژێ رازی بت) پشکداری د شەڕێ بەدرێ و هەمی شەڕێن دی ژیدا کرییە شەڕێ تەبۆکێ تێ نەبت، و د گەلەک ژ ڤان شەڕاندا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ئالایێ موسلمانان کربوو د دەستیدا، و گرنگترین شەڕێن وی پشکداری تێدا کری، ئەڤەنە:

١- بزاڤا سەرایا.

٢- شەڕێ قەشیرە.

٣- شەڕێ بەدرێ یێ ئێکێ.

٤- شەڕێ ئوحودێ.

٥- شەڕێ بەنوو نەزیر.

٦- شەڕێ حەمراء ئەلئەسەد.

٧- شەڕێ ئەحزاب.

## هلبژارتنا عەلی:

پشتی خەلیفێ راشدی عوسمانێ کوڕێ عەففانی شەهیدبووی، عەلییێ کوڕێ ئەبووتالبی هاتە هلبژارتن دا ببتە خەلیفە، و ئەو سەحابییێن هنگی ل مەدینێ چوونە دەستی و ئەو هلبژارت، ژ بەر کو ل وی دەمی کەس ژ وی باشتر نەبوو، و پشتی عوسمانی کەسێ نەگۆتبوو ئەز خەلیفەمە، و خوە ئیمام عەلی ژی داخوازا خیلافەتێ نەکربوو، و ئەو یێ پێ رازی ژی نەبوو، بەلێ سەحابییان گەلەک داخواز ژ وی کر ئەو خیلافەتێ وەرگرت دا فتنە بەرفرەهـ نەبت. و ئیمام عەلی چار سال و نەهـ هەیڤ و سێ ڕۆژان خەلیفە بوو.

## تێگەهێن ڕێڤەبەرییێ ل نک ئیمام عەلی:

### أ- شارەزایی و زانین:

ئیمام عەلی ب گرنگی ددیت کو بەرپرس کەسەکێ خودان زانین و شارەزایی بت، و ئەگەر ئەو یێ وەسا بت دڤێت مللەت گوهدارییا وی بکەت، ئەگەر نە.. وی مافێ گوهدارییێ نینە، ئەمیرلموئمنین دبێژت: ((دڤێت هوون گوهدارییا وی بکەن یێ هوون نەشێن نەزانینا وی بۆ خوە بکەنە هێجەت، و ئەگەر ئەو یێ نەزان بت، هەوە مافێ نەگوهدارییێ هەیە، ژ بەر کو ئەو دێ بەرێ هەوە دەنە تێبرنێ)).

### ب- بەرهنگاریا هشکاتییێ:

هندەک بەرنامە و سیستەمێن ڕێڤەبەرنێ هەنە هشکاتییێ پەیدا دکەن، و دەمی زەعێ دکەن، و شیان و مافان بەرزە دکەن، و گەلەک کارێن ڕێڤەبرنێ هەنە مرۆڤ هزرا ب جهئینانا وان ناکەت، چونکی ژ بەر رۆتینێ وان دەمەکێ درێژ پێڤە دچت.

### ج- زێرەڤانییا هشیار:

د هەر کارەکێ ڕێڤەبرن و ڕێکخستنێدا زێرەڤانی کارەکێ فەرە، و ئیمام عەلی بەحسێ ڤی کاری دکەت، دەمێ دبێژت: ((تو هندەک زێرەڤانان ژ مرۆڤێن ڕاستگۆ و وەفادار بهنێرە، دا زێرەڤانییێ ل وان بکەن، و ئەگەر تو خەمێ ژ کارێ وان بخۆی دەمێ کەس تە نەبینت، ئەڤە دێ وان پال دەت کو ئەو د دەستپاک بن، و د گەل خەلکی دنەرم بن)).

زێرەڤانی ب دیتنا ئیمامی دلۆڤانی و پشتەڤانییە بۆ وی یێ زێرەڤانی لێ دئێتەکرن کو ئەو کارێ خوە ب دلسۆزی بکەت، و زێرەڤانی دڤێت ژ لایێ هندەک کەسێن ڕاستگۆ و وەفادار ڤە بێتەکرن، دا هلسەنگاندنا وان یا دورست بت، و زێرەڤانییا وان هاریکارییەکا گرنگە بۆ پێشکەفتنێ، مرۆڤان بەر ب بزاڤ و دلسۆزییا د کاریدا دبەت.

**د- دامەزراندنا فەرمانبەران دڤێت ل دووڤ هندەک پیڤەران بت**، نە کو ل دووڤ ناسین و مرۆڤکانێ:

و ئیمام ڤێ چەندێ د وێ کاغەزا خوەدا ئاشکەرا دکەت یا وی بۆ مەزنێ مسرێ هنارتی، دەمێ دبێژتێ: ((پاشی بەرێ خوە بدە کارێن خوە، و تو وان مرۆڤان بۆ کارێن خوە هلبژێرە یێن تو دجەڕبینی و دزانی ب کێر دئێن، نە ل دووڤ مرۆڤکانێ)).

ئانکو: دڤێت ئەو مرۆڤ بێتە جەڕباندن یێ بۆ کارەکی دئێتە هلبژارتن، و ژ بەر هندەک پەیوەندییێن تایبەت کەسەک نەئێتە دامەزراندن ل جهەکی، یان د کارێ ویدا بێتە بلندکرن.

پاشی ئیمام دبێژت: ((پاشی بەرێ خوە بدە نڤیسەرێن خوە، و هەچییێ باشتر بت کارێ خوە بکە د دەستاندا)) نە کو یێ پتر نێزیکی تە و مالباتا تە بت، ژ بەر کو دەلیڤە بۆ مرۆڤکانێ نینە، و هەقی و ئەمانەت دڤێت پیڤەر بت.

### دان و ستاندن:

١- دەمێ خیلافەتا عەلییێ کوڕێ ئەبووتالبی چەند بوو؟

٢- چاوا عەلی بۆ خیلافەتێ هاتە هلبژارتن؟

٣- کارێ زێرەڤانییێ د ڕێکخستنێن ڕێڤەبەرییێدا چیە؟

٤- ئەو چ سالۆخەتن کو دڤێت ل نک کەسێ زێرەڤان هەبن؟

وانەیا بیست و سێیێ:

# خەلیفێ راشد و چاکسازێ مەزن

## عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی (خودێ ژێ رازی بت)

عومەر کورێ عەبدلعەزیزێ کورێ مەروانی کورێ حەکەمێ کورێ ئەبوولعاسی کورێ ئومەییەیێ کورێ عەبدشەمسی کورێ عەبدمەنافییە، ئیمامێ زانا و موجتەهدێ زاهد، خەلیفەیێ راشد.

بابێ وی عەبدلعەزیزێ کورێ مەروانی ئێک ژ چاکێن مالباتا ئومەییەی بوو.

ل سالا (٦١) مشەختی ل مەدینێ هاتبوو سەر دنیایێ، و ل سالا (١٠١) مشەختی دەمێ ژییێ وی چل سال ل دێر سەمعان ل دەڤەرا مەعەررە ل شامێ مربوو.

### سالۆخەتێن وی:

عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی مرۆڤەکێ ئەسمەر و ڕووگەش و زراڤ و ڕیهـ بۆش بوو.

کەسینییا وی ب کارلێکرنا چەند ئەگەرەکان هاتبوو دورستکرن، ژ وان:

١– دەمێ هێشتا ئەو زارۆک وی داخوازا زانینێ کربوو و قورئان ژ بەر کربوو.

٢– ئەو جڤاکا عومەر تێدا هاتییە پەروەردەکرن کارەکێ باش د ئاڤاکرنا کەسینییا ویدا هەبوو، و عومەر ل دەمەکێ ژیابوو تەقوا و چاکی و ڤیانا زانینێ و کارێ ب کیتاب و سوننەتێ تێدا دبەلاڤ بوون.

٣– ئەو ل سەر دەستێ فقهزانێن مەدینێ یێن مەزن هاتبوو پەروەردەکرن.



## ڕێبازا وی د ڕێڤەبرنا دەولەتێدا:

پشتی عومەر بۆ خیلافەتێ هاتییە هلبژارتن، ئەو ب سەر مینبەرێ کەفت، و گۆت:

((گەلی مرۆڤان، ئەڤە بەلایەکە هاتییە سەرێ من بێ گۆتنا من بێتە وەرگرتن، یان ئەز داخواز بکەم، یان گۆتنا موسلمانان بێتە وەرگرتن، و ئەز ڤی باری ژ سەر ملێن خوە ددانم، و هەوە ئازا دکەم، و هەچییێ هەوە بڤێت وی بۆ خوە هلبژێرن)).

خەلکی ب ئێک دەنگی گۆت: مە تو هلبژارتی ببیە ئەمیرلموئمنین، و ئەم ب تە درازینە.. ل ڤێرێ وی هەست کر کو چو ڕێ وی نەمان، و دڤێت ڤی باری هلگرت، لەو وی ڕێبازا سیاسەتا خوە دەستنیشانکر و گۆت:

((پشتی پێغەمبەرێ هەوە چو پێغەمبەر نینن، و پشتی وێ کیتابێ یا بۆ وی هاتی چو کیتاب نائێن، ئەو تشتێ خودێ حەلالکری هەتا ڕۆژا قیامەتێ دێ مینت حەلال، و ئەز نە قازیمە، ئەز فەرمانێ ب جهـ دئینم، و ئەز چو ڕێکێن نوو دەرنائێخم، بەلکی ئەز دووکەفتنا ڕێکا یێن بەری خوە دکەم، د بێ ئەمرییا خودێدا گوهدارییا کەسێ نائێتەکرن، و ئەز ژ هەوە هەمییان باشتر نینم بەلکی ئەز ئێک ژ هەوەمە، بەلێ خودێ بارێ من ژ یێ هەوە گرانتر لێ کرییە)).

## دادی د دەولەتا عومەریدا:

دادییێ د دەولەتا عومەریدا دو ڕەنگ بۆ هەبوون:

١- ڕێگرتنا ل زۆردارییێ: ئانکو وی نەدهێلا زۆرداری بێتەکرن، و مافێن مرۆڤان بێنە پێلێدان، چ پەیوەندی ب وان یان مالێ وان ڤە هەبت، و وی شوونوارێن تەعدایی و زۆرداریێ ژی نەدهێلان، و مافێ هەر کەسەکێ ستەم لێ هاتییەکرن بۆ وی دزڤڕاندەڤە.

٢- ڕەنگێ دویێ پتر ب دەولەتێ ڤە یێ گرێدایی بوو، کو ئەو مافێ مللەتی بپارێزت، و ئازادی و ژیانا وان دابین بکەت، دا کەسەکێ بێزار و لاواز و بێکەس و هەژار وترسناک نەمینت، و ئەڤە ئەرکێ حاکمییە.

ئیمامێ عومەر (خودێ ژێ رازی بت) ب باشترین ڕەنگ ب ڤی کارێ مەزن ڕابووبوو، و بەرپرسی و دەسهەلات ب دیتنا وی ئەو بوو مەزن ب کارێ خەلکی ڕابت و مافێ وان بپارێزت، و وان مەرجان پێک بینت یێ خەلکی ل سەر بناخەیێ وان دەنگێ خوە دایێ، و خەلیفە ب دیتنا وی کرێگرتییێ ئوممەتێیە، دڤێت ئەو داخوازێن وان بۆ بجهـ بینت.

## ڕێڤەبرن د دەولەتا عومەریدا:

١- عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی گەلەک ب هووری مەزنێن دەولەتا خوە ژێدگرتن، و وی ئەو ژ ناڤ مرۆڤێن چاک و خێرخواز هلدبژارتن، دا پێش خەلیفەیی ڤە ل هەرێمێن خوە کارێ خەلکی ب ڕێڤەببەن، و خەلیفە ئەگەر چەند د سیاسەت و ڕێڤەبرنێدا یێ شارەزا بت، ئەو نەشێت سەرکەڤتنێ ب دەست خوە ڤە بینت ئەگەر زەلامێن دەولەتا وی ب دورستی نەهاتبنە هلبژارتن.

٢- چاڤدێرییا ئێکسەر بۆ ڕێڤەبرنا کاروبارێن دەولەتێ: عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی ب خوە چاڤدێری ل وان تشتان دکر یێن د دەولەتا ویدا چێ دبوون، و وی دووچوونا کارێ مەزنێن هەرێمان ژی دکر، و تشتێ هاریکارییا وی د ڤێ چەندێدا دکر ئەو دەزگەهێن دەولەتێ بوون یێن عەبدلمەلکێ کوڕێ مەروانی پێشڤەبرین.

٣- پلاندانان د ڕێڤەبرنێدا: پلاندانان ب ڕامانا خوە یا گشتی ئەو کریارە یا دئێتەکرن دا پێتڤییێن پاشەڕۆژێ پێ جهـ بێن، و ڕێکێن وێ ب جهێنانێ بێنە دەستنیشانکرن. و ب ڤێ چەندێ ئەم دشێین بێژین: پلاندانان د ئیسلامێدا بەرهەڤییا ئەڤرۆیە بۆ وی تشتێ ل پاشەڕۆژێ د کار و ژیانا مرۆڤیدا دئێتە ڕێکا وی. و عومەری بێ پلاندانان چو بڕیار نەددان، و وی هزر د دووماهییا کاراندا دکر.

٤– رێکخستن د رێڤەبرنێدا: رێکخستن تمامکەرا پلاندانانێیە، بۆ ئاڤاکرنا وان تشتێن کو پێتڤییە بێنەکرن دا پلان ب جهـ بێن، و عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی رێکخستن کربوو ژ گرنگترین کارێن ئێکێ یێن رێڤەبرنێ، و وی تێگەها رێکخستنێ د رەفتارێ خوە یێ رێڤەبرنێدا موکوم کربوو.

٥– خوەپاراستن ژ گەندەلییا رێڤەبرنێ: هەتا عومەر سیستەمێ خوە یێ رێڤەبرنێ دوور بێخت ژ گەندەلییێ، وی رژدی ل رێکێن خوەپاراستنێ دکر، و وی هەمی رێ ل وێ ژەهرێ دگرت یا دکەفتە لەشێ رێڤەبرنێدا، وەکی: خیانەتێ و درەوێ و بەرتیلان و پێشکێشکرنا دیارییان بۆ بەرپرسان، و دەستبەردان و ئیسرافێ.

## دان و ستاندن:

١– ئەو چ ئەگەر بوون کار د ئاڤاکرنا کەسینییا عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزیدا کری؟

٢– بۆ چ عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی مەزنێن دەولەتا خوە ژ ناڤ مرۆڤێن چاک و خێرخواز ژێدگرتن؟

٣– ڤان پەیڤان پێناسە بکە:

أ– پلاندانان د ئیسلامێدا.

ب– رێکخستنا رێڤەبرنێ.

٤– دادییێ د دەولەتا عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزیدا دو رەنگ هەبوون، ئەو چنە؟

٥- ب دیتنا عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی بەرپرسی و دەسهەلات چ بوون؟

### وانەیا بیست و چارێ:

# چەند دیمەن ژ ژیانا تابعییان

## زەینولعابدینێ کوڕێ حوسەینی

بنەمالا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) جهەکێ بلند و بهایەکێ مەزن ل نک هەمی موسلمانان هەیە، و ژ بەر تەقوا و دلسۆزییا وان د پەرستنا خودێدا، و ڕەوشتێ وان یێ باش و زوهد و دەستکێشانا وان ژ دنیایێ، پشتی پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ئەو باشترین مرۆڤن، و موسلمان هەمی حەز ژ وان دکەن.

دڤێت ئەم چاڤ ل وان بکەین، و ژ وان فێر ببین، و مفایی ژ ڕێبازا وان یا ڕاست وەرگرین، چونکی ئەو ژ بنەمالا پێغەمبەرێ خودێنە (سلاڤ لێ بن) .

و (زەینولعابدین) ئێک ژ زەلامێن ناڤدارێن بنەمالا پێغەمبەرییە (سلاڤ لێ بن).

### ناڤ و ناسناڤێ وی:

ناڤێ وی عەلییە، کوڕێ حوسەینێ کوڕێ عەلییێ کوڕێ ئەبووتالبییە، خودێ ژێ ڕازی بت.

خەلکی ناسناڤێ وی کربوو (زەینولعابدین) ژ بەر کو ڕەوشت و بهایێ وی ژ یێ هەمی کەسان مەزنتر بوو، و وی ژ هەر کەسەکێ دی پتر قەنجی د گەل خەلکی دکرن، و هاریکارییا وان دکر.

### زانین و تەقوایا وی:

زەینولعابدین ل بەر دەستێ بابێ خوە حوسەینی (خودێ ژێ ڕازی بت) هاتبوو پەروەردەکرن، و زانین ژ وی وەرگرتبوو، و د ئەخلاق و ڕەفتارێ خوەدا چاڤ ل وی کربوو، و وی ل مزگەفتا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) تێکەلییا زانایێن مەزن دکر، هەتا بوویە زانایەکێ مەزن و تەقوادار.



## ژ ڕەوشتێ وی یێ باش:

زەینولعابدین، و ژ بەر کو ژ مالباتا پێغەمبەری بوو (سلاڤ لێ بن) خودان رەوشتەکێ باش بوو، لەو خەلکی گەلەک حەز ژێ دکر، و بهایەکێ زێدە دداییێ، و دئێتە ڤەگوهاستن کو مرادا گەلەک موسلمانان ئەو بوو وی ببینن و سلاڤ کەنێ.

ژ ڕەوشتێ وی یێ باش وەکی حەسەنێ کوڕێ حوسەینی ژێ ڤەدگوهێزت، ئەڤەیە حەسەن دبێژت:

ئەز و پسمامێ خوە زەینولعابدین ب هەڤڕکی چووین، و ئەز ژ کەرب ڤە چوومە نک وی، و تشتەک نەما من نەگۆتییێ، و ئەو هەر ما بێ دەنگ، پاشی ئەز چووم. و ب شەڤێ من گوهـ لێ بوو ئێکی دەرگەهـ قوتا، ئەز چووم دا بەرێ خوە بدەمێ کانێ ئەو کییە، من دیت ئەو زەینولعابدین بوو. من هزرکر ئەو دێ بەرسڤا من دەت سەرا وێ نەخوەشییا من گەهاندییێ، بەلێ وی گۆت: برایێ من! ئەگەر ئەو تشتێ تە گۆتییە من یێ دورست بت، خودێ ل من نەگرت، و ئەگەر یێ دورست نەبت، خودێ ل تە نەگرت.. پاشی سلاڤی من کر و چوو. ئەز د دووڤدا چووم و من گۆتێ: سووند بت ئەز جارەکا دی تشتەکی نەکەم تە پێ نەخوەش بت. دلێ وی ما ب من ڤە و گۆت: من گەردەنا تە ئازا کر.

## دان و ستاندن:

١- بنەمالا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) کینە؟ و بهایێ وان ل نک موسلمانان چەندە؟

٢- ناڤێ زەینولعابدینی چیە؟ و ئەو کوڕێ کێیە؟ و بۆ چ دگۆتنێ (زەینولعابدین)؟

٣- هندەک ڕەوشتێ زەینولعابدینی بێژە؟

٤- بۆ چ خەلکی حەز ژ زەینولعابدینی دکر؟

٥- چ مفا د سەرهاتییا حەسەنی د گەل زەینولعابدینیدا هەیە؟

## وانەیا بیست و پێنجێ:

# ژ زانایێن کورد

# مەلا خەلیلێ سێرتی



گەلەک زانایێن کورد هەنە خزمەتا ئیسلاما پیرۆز کرییە، و پشکداری د ئاڤاکرنا شارستانییا ئیسلامیدا کرییە، و رۆلێ وان د بەلاڤکرنا ڕەوشەنبیرییا گشتی و زانینێن ئیسلامیدا ل جیهانا ئیسلامی یێ بەرچاڤ بوویە، ژ بەر کو وان ب هزاران کتێب د زانینێن جودادا و ب گەلەک زمانان پێشکێش کرینە، و مەلا خەلیلێ سێرتی ئێک ژ وان زانایێن مەزن بوو.

## ناڤێ وی:

ناڤێ وی مەلا خەلیلە، کوڕێ مەلا حوسێنێ کوڕێ مەلا خالدییە. ل سالا ١٧٥٤ ز، ل باژێڕێ هیزانێ، ئەو سەر ب ویلایەتا بدلیسێ ڤە ل باکوورێ کوردستانێ، هاتبوو سەر دنیایێ، بەلێ چونکی ئەو پشتی هنگی ل باژێڕێ سێرتێ ئاکنجی بووبوو دگۆتنێ: مەلا خەلیلێ سێرتی. و ل ڤی باژێڕی مەلا خەلیل ل سالا ١٨٤٣ ز چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ.

## زانین و ڕەوشەنبیرییا وی:

مەلا خەلیل ژ مالباتەکێ بوو حەز ژ زانین و زانایان دکر، هێشتا دەمێ ئەو زارۆک بابێ وی ئەو برە مزگەفتێ و دانا بەر دەستێ زانایێن وی سەر دەمی، و ژ بەر کو ئەو مرۆڤەکێ زیرەک و بیرتیژ بوو هەر زوو ئەو فێری خواندن و نڤیسینێ بوو، و د زانینێدا پێشکەفت، و ئەو ل گەلەک گوند و باژێران گەڕیا دا زانینێ وەرگرت، ژ وان: سێرت و جزیرا بۆتان و بدلیس و ئامێدییێ.. و وی ئیجازا مەلاتییێ ژ زانایێ مەزن مەلا مەحموودێ بەهدینی، موفتییێ ئامێدییێ ل وی دەمی، وەرگرتبوو.

مەلا خەلیلی ژیانا خوە ب مەلاتی و دەرسدانێ ڤە بۆراندبوو، و گەلەک زانایێن مەزن یێن وی دەمی فەقییێن وی بوون. هەر وەسا وی گەلەک کتێبێن گرنگ ژێ نڤیسیبوون، و ئەو ئەدیب و شاعر ژێ بوو، وی بەرهەمێ خوە ب کوردی و عەرەبی ددانا.

## بەرهەمێ وی:

زانا و ئەدیبێ ناڤدار مەلا خەلیلێ سێرتی بەرهەمەکێ زێدە هەبوو، و کتێبێن وی -کو ب کوردی و عەرەبینە- پترن ژ (٣٥) کتێبان، و د گەلەک بابەتاندانە، و ژ گرنگترین کتێبێن وی:

١- تبصرة القلوب (تەفسیرا قورئانا پیرۆزە).

٢- ڤەهینۆکا (نهج الأنام) د بابەتێ باوەرییێدایە، ب زمانێ کوردی و یێ عەرەبییە.

٣- ڤەهینۆکا تەجویدێ، ب زمانێ کوردی.

## دان و ستاندن:

١- مەلا خەلیل کی بوو؟ و کەنگی و ل کیڤە هاتبوو سەر دنیایێ؟

٢- بۆ چ ل دەمەکێ زوو ئەو فێری خواندن و نڤیسینێ بوو؟

٣- ناڤێ سەیدایێ وی چ بوو یێ ئیجازە دایێ؟

٤- ژ بلی کتێبێن وی یێ دینی، چ ڕەنگێ دی یێ نڤیسینێ وی هەبوو؟

٥- چەند کتێب وی هەبوون؟ ناڤێ سێ کتێبێن وی بێژە.

٦- ناڤێ سێ زانایێن دی یێن کورد بێژە کو خزمەتا ئیسلامێ کربن.

## الفهرست


| ژ | بابەت | لاپەر |
|---|---|---|
| ١ | پیشگۆتن | ٣ |
| ٢ | وەرزێ ئێكێ | ٥ |
| ٣ | وانەیا ئێكێ – باوەری ب كتێبێن ئەسمانی | ٧ |
| ٤ | وانەیا دویێ – باشیكرن د دینی و پەرستنێدا | ١٠ |
| ٥ | وانەیا سێیێ – تشتێ پشتی مرنێ مفایی دگەهینتە مرۆڤی | ١٢ |
| ٦ | وانەیا چارێ – برایینی و پێكڤەژیان د ئیسلامێدا | ١٥ |
| ٧ | وانەیا پێنجێ - داد پەروەری | ١٧ |
| ٨ | وانەیا شەشێ- جهئینانا سۆز و پەیمانێ | ٢٠ |
| ٩ | وانەیا حەفتێ- رێزگرتن د ئیسلامێدا | ٢٢ |
| ١٠ | وانەیا هەشتێ – دلۆڤانی د ئیسلامێدا | ٢٥ |
| ١١ | وانەیا نەهێ- ژسەرهاتیێن پێغەمبەران ١ – بێنفرەهییا ئەییوبی | ٣٢ |
| ١٢ | وانەیا دەهێ- ڕۆژی و هندەك حوكمێن وێ | ٣٧ |
| ١٣ | وانەیا یازدەیێ- مەرجێن فەربوونا ڕۆژیگرتنێ | ٤٠ |
| ١٤ | وانەیا دوازدەیێ – خوەپارزتن ژ مەترسییا مینان | ٤٢ |
| ١٥ | وانەیا سێزدەیێ- حەرامكرنا بەرتیلێ | ٤٦ |
| ١٦ | وەرزێ دویێ | ٤٩ |
| ١٧ | وانەیا چاردەیێ- هزركرن د چێكرییێن خودێدا | ٥١ |
| ١٨ | وانەیا پازدەیێ- پێكئینان د ناڤبەرا خەلكیدا | ٥٨ |
| ١٩ | وانەیا شازدەیێ- ژئەحكامێن زەكاتێ | ٦٤ |
| ٢٠ | وانەیا هەڤدەیێ- مفایێن دانا خێران | ٦٨ |
| ٢١ | وانەیا هەژدەیێ- ژمافێن موسلمانی ل سەر موسلمانی نەبەلاڤكرنا گوتنێن خراب ونهێنیان | ٧٠ |
| ٢٢ | وانەیا نۆزدەیێ- هلگرتنا متایی دا گران بت | ٧٣ |
| ٢٣ | وانەیا بیستێ- ژسەرهاتییێن پێغەمبەران ٢ – بوونا مووسایی سلاڤ لێ بن. | ٧٧ |
| ٢٤ | وانەیا بیست وئێكێ- چەند دیمەن ژژیانا سەحابییان | ٨١ |
| ٢٥ | وانەیا بیست و دویێ- عەلییێ كوڕێ ئەبووتالبی | ٨٣ |
| ٢٦ | وانەیا بیست وسێیێ- خەلیفێ راشد و چاكسازێ مەزن | ٨٦ |
| ٢٧ | وانەیا بیست وچارێ- چەند دیمەن ژژیانا تابعییان زەینولعابدینێ | ٩٠ |
| ٢٨ | وانەیا بیست وپێنجێ- مەلا خەلیلێ سێرتی | ٩٢ |
| ٢٩ | الفهرست | ٩٤ |